بە یارمەتیی ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان لەچاپ دراوە

١

# یادی سجادی

سەرجەمی ئەو وتارانەیە لە ئاهەنگی چلەی کۆچکردوو مامۆستا (علاء الدین سجادي) دا خوێنرانەوە یا بەبۆنەی کۆچکردنی و لەیادیدا لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانا بڵاوکراونەتەوە



کۆکردنەوەی :

دلێر علاء الدين سجادي

چاپخانەی ئیشبیلیە لە بەغدا

١٩٨٧

به یارمەتیی ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیری‌و لاوان لەچاپ دراوە

# یادی سجّادی

سەرجەمی ئەو وتارانەیە لە ئاهەنگی چلەی کۆچکردوو مامۆستا (علاء الدین سجادی) دا خوێنرانەوە یا بەبۆنەی کۆچکردنی‌و لەیادیدا لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانا بلاوکراونەتەوە

کۆکردنەوەی :

دلێر علاء الدین سجّادی

چاپخانەی ئیشبیلییە لە بەغدا

١٩٨٧

# ماموستا علاءالدین سجادی
# له چەند دێرێکدا

● ناوی علاءالـدین نجم الـدین عصـام الـدین و له بنـەمـاڵـەی ناوداری (سجادی)یە له کوردستان.

● ساڵی ۱۹۰۷ هاتووەتە دنیاوەو، له کۆشی خێزانێکی ئایینی‌دا گەورە بووە.

● ساڵی ۱۹۲۷ هاتـــووەتـــە سلێمـــانی بۆ خوێنـدن و، له مزگـەوتی شێخ جەلال و مزگەوتی حاجی مەلا ڕسووڵ بە فەقێیەتی دامەزراوە.

● ساڵی ۱۹۳۸ ئیجـازەی مەلایـەتی لای‌مـامـۆستا شێخ بابەعەلی تەکیەیی وەرگرتووەو چووە بۆ بەغداو، له مزگەوتی نەعیمە خاتوون له مەیدان بووە بە پێشنوێژو، دانیشتن و کاری ڕۆژانەی لەو مزگەوتە بووە.

● له بەغدایش لای مامۆستایان شێخ امجد الزهاوی‌و شێخ محمد القزلجی بە هەندێ له زانستە ئیسلامی‌یەکاندا چووەتەوە.

● له ساڵی ۱۹۳۹دا چووەتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی‌و له ۱۹٤۱دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری گەلاوێژو وردە وردە بووە بە هەمەکارەی‌و تا داخستنی له ۱۹٤۹دا لەگەڵی بووە.

● له ساڵی ۱۹٤۸دا پاش ڕاپەڕینە مەزنەکەی کانوون گۆڤاری (نزار)ی بە عەرەبی‌و کوردی دەرکردووە کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری سیاسی بووە.

● پاش شۆڕشـی پیـــرۆزی ١٤ی تەمـــووزو تا ساڵی ۱۹۷٤ مامـــۆستـــای ئەدەب و مێژووی ئەدەبی کوردی بووە له کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا.

● له ساڵی ۱۹۷٤دا کرا بە ئەمینداری گشتیی ئەوقاف و ۳ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

● ساڵانی پاشەوەی بە خانەنشینی‌و بە خزمەتی ئەدەبەوە بەڕێ بردووە.

● ئێوارەی ڕۆژی پێنج شەمەی ۱۹۸٤/۱۲/۱۳ کۆچی دوایی کردووەو، له گۆڕستـانی شێخ عبـدالقـادری گەیـلانی، لەنزیك شێخ عبدالرحمن ابو

الوفاى نەقشبەندى‌و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاك سپێرراوە.

● ئەمەش ناوی دانراوەکانی‌و ساڵی دانیان:

١- مێژووی ئەدەبی کوردی، ١٩٥٢ (چاپی دووەم ١٩٧١).
٢- ناوی کوردی، ١٩٥٣.
٣- ڕشتەی مرواری، بەرگی یەکەم، ١٩٥٧.
٤- ڕشتەی مرواری، بەرگی دووەم، ١٩٥٧.
٥- ڕشتەی مرواری، بەرگی سێهەم، ١٩٥٨.
٦- ڕشتەی مرواری، بەرگی چوارەم، ١٩٦٨.
٧- ڕشتەی مرواری، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٢.
٨- ڕشتەی مرواری، بەرگی شەشەم، ١٩٧٩.
٩- ڕشتەی مرواری، بەرگی حەوتەم، ١٩٨٠.
١٠- ڕشتەی مرواری، بەرگی هەشتەم، ١٩٨٣.
١١- گەشتێك لە کوردستانا، ١٩٥٦.
١٢- شۆڕشەکانی کورد، ١٩٥٩.
١٣- هەمیشە بەهار، ١٩٦٠.
١٤- دەستوور وە فەرهەنگی زمانی کوردی، ١٩٦١.
١٥- ئەدەبی کوردی‌و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی، ١٩٦٨.
١٦- نرخ شناسی، ١٩٧٠.
١٧- دوو چامەکەی نالی‌و سالم، ١٩٧٣.
١٨- کوردواری، ١٩٧٤.
١٩- دەقەکانی ئەدەبی کوردی، ١٩٧٨.
٢٠- خۆشخوانی، ١٩٧٨.







**دوو دیمەنی ئارامگای مامۆستای خوالێخۆش بوو**

# پێشـــەکی

که له کۆبونەوەی یادکردنەوەی باوکی کۆچکردوی خۆشەویستما دانیشتبوم گوێم لەو وتــارو شیعـرانـه ئەگـرت که بەمـەبەستی قەدر زانینی ئەو نووسیبوویانن و ئەیـانخـوێنـدنـەوە، ئەوەنـدەی هەمـوو تەمـەنی لەوەپێشم شارەزای کارامـەیی و دڵسۆزی و خزمەتگوزاریی باوکم بووم که بەداخەوە تا له ژیانا بوو نەمتوانی خۆم لەسەرچاوەی پاکو ڕەوانی تێراو کەم. هەر ئەو ڕوژە بیرم له پێویستیی بڵاوکردنەوەی ئەو وتارو شیعرانه کردەوە که لەو کۆڕەدا خوێنرانەوە، بۆئەوەی خەڵکێکی زۆرتریش که نەهاتبوون بۆ کۆبوونەوەکه ـ بیخوێننەوەو، ئەوانیش وەك ئێمه شارەزای پایەی بڵندی باوکم ببن و لەو بابەته سوودەمەند ببن.

که ئەم بیرەم پاشتر لەگەڵ هەندێ دۆست و برادەری باوکم باس کرد، ئەوانیش باسی دوو کتێبی باوکمیان بۆ کردم که له یادی ئەمین زەکي بەگ و پیرەمێردا بڵاوی کردوونـەتـەوەو ئەوبـابـەتـانـەیـان تیـایه له ڕۆژی یادکردنەوەیاندا خوێنراونەتەوەو، ئەوانیش بیرەکەمیان لا پەسەندو پێ باش بوو. بۆبەجێ هێنانی ئەم کاره من خۆم هەرکــەس به هەقــدارتــر زانی و، تا وەك سوپــاسێکیش وابێ له بنــەمـاڵـەی سەججـادیـیـەوە بۆ هەموئەوانەی لەوڕۆژەدا سۆزی دەروونی خۆیانیان بەرانبەر به یادی باوکم دەربڕی.

هیــوام وایــه بەم کاره بچکـۆلـه، پێـویستی یـەکی ژیـانی ڕۆشنبیـریی کوردم بەجێ هێنابێ و، کەمێکیش قەزری باوکم بەسەر ئێمه خۆمان و بەسەر هەمووژیانی ڕۆشنبیـریی کوردیـیەوە دابێتـەوەو، گیـانی پاکیمـان له بەهەشتی بەریندا کەمێك شادمان کردبێ.

دلێر علاءالدین سجادي

# لەبارەی ئەم کتێبەوە

## محمدی مەلا کریم

ساڵـەهـایـەکی دوورو درێـژ، مامـۆسـتـای ڕەحمـەتیمـان مامۆستا عەلائەددین سەججـادی، لەم بەغــدایـە بەدەم هاوارو هانای هەموو ڕۆشنبیرێکی کوردەوە بوو دەستی قەڵەم بگرێ و بتوانێ بنووسێ. تا پاش شۆڕشی چواردەی تەمووزی ۱۹۵۸یش کەم کتێبی کوردی لەبـەغـدادەرچـووە بنووسەکەی دانیشتووی دەرەوەی بەغدا بوو بێ و مامـۆستـا عەلائەددین چاپخانە بۆ پەیداکەر و ڕاستکەرەوەی پرۆڤەی چاپ و سەرپەرشتی کەری لەچاپدانی نەبووبێ.

دوو کۆمەڵە شیعری مامۆستا گۆران، (هەڵبژاردە لە چیرۆکی بێگانە)کەی، دوو سێ کتێبی باوکم، کتێبەکانی مامۆستا شاکر فەتاح و حەسەن فەهمی جاف، خەیام بەکوردییەکەی شێخ سەلام و گەلێکی تریش بەرهەمی ڕەنجی مامۆستا عەلائەددینن.

سەرەڕای ئەوە هەر مامــۆستـــا عەلائـەددینیش بوو یادگـاری ئەمین زەکی بەگی مێـژوونووسی گەورەو پیرەمێردی ئەدیب و فەیلەسووف و ڕۆژنامەنووسی بەزیندوی بۆ هێشتینـەوە: کەرەستـەکـانی یادی چلەیـانی کرد بە کتێب و بڵاوی‌کـردنەوە، کە ئیستا بوون بە دوانی بەنرخ لە سەرچاوەکانی ئەدەب و مێژووی کورد.

بۆیـە، ئەگـەر لەبـەر هیـچ کامی‌تـر لەخـزمـەتە گەورەو گرانەکانی مامۆستا سەججادی نەبێ بە ئەدەب و بەمێژوو و بە کولتووری کورد، تەنها لەبەرئەمە، حەقی مامــۆستـــا عەلائـــەددین بوو بەســـەر هەمـــوو ڕۆشنبیـــرانی کوردەوە، بەسەرهەموو دەزگا زانستی و ڕۆشنبیرییەکانی کوردەوە، بێ «یاد»ی نەکەن و، وەك کۆڕی‌چلەکەیان بۆ ڕێکخست، ئەو وتارو شیعرانەیشیان کە لەو کۆڕەدا خوێنرانەوە، لەگەڵ باسێکی بەپێزدا لەبارەی ژیان و هەڵسووران و چالاکیی مامۆستاو کارە زانستییەکانیەوە، لەنێوان دوو بەرگی کتێبێکدا کۆبکردایەتەوەو، لەچاپیان بدایەو، بەو کارە وەفاداریی خۆیانیان بەرانبەر بەو مامۆستایە پیشان ئەدا کە زوربەی تەمەنی خۆی، لە سنووری تواناو دەسەلاتیا، بۆ خزمەتی

ڕۆژنامەنووسی کوردی‌و ئەدەب و مێژووی کورد بەسەربردو، خزمەتێکی گەورەیشیان بە خوێنەوارى کورد ئەکرد، بەوە کە سەرچاوەیەکی باشی لەبارەی مامۆستا سەججادی‌یەوە بخەنە بەردەست.

وا ساڵێك بەسەر کۆچی دوایی ناوادەی مامۆستادا تێ‌ئەپەڕێ‌و، لە ماوەی ئەم ساڵەدا لە هیچ لایەکەوە دەنگوباسی پرۆژەیەکی‌وامان بەر گوێ نەکەوت. بۆیە زۆر بەجێ‌و پەسەندە دلێری کوڕی مامۆستا لەئاستی خۆیەوە ڕاست بێتەوەو لەجیاتی هەموو ڕۆشنبیرانی کورد ئەم ئەرکە بەرانبەر بە باوکی، نەك تەنها وەك باوك، بەڵکو وەك ڕۆشنبیرو خزمە تگوزارێکی گەورەی ئەدەب و مێژووی کورد، پێشکەش بکا بە جەماوەری گەلی کورد.

من لەکاتێکا کە ئومێدەواریی خۆم دەربڕئەبڕم ئەم خزمەتەی کاك دلێر بەشێکی ئەو قەرزە قەبەیە بداتەوە کە لەئەستۆی هەموو ڕۆشنبیرێکی کوردایە بەرانبەر بە مامۆستا سەججادی، بە هیوای ئەوەیشم کە ببێ بە پاڵ پێوەنەرێکی باشی هەموو ڕۆشنبیرە لێ‌هاتووەکانی کورد، کە ئیتر لەئاست کۆستێکی زلی وەك کۆستی کۆچی دوایی‌کردنی مامۆستا عەلائەددین سەججادیدا ئەوەندە کەمتەرخەم و هەست بە لێ‌پرسینەوە نەکردوو نەبین.

١٩٨٥/١١/٧

خۆشحاڵین بەبانگ‌کردنتان بۆ ئامادەبوون لە کۆڕی چلەی زانـــــای شکۆدار خوالێخۆشبوو علاءالدین سجـــــادی‌دا کە دەزگـــــای رۆشنبیری و راگەیاندنە کوردییەکان لە سەعات چواری ئێـــوارەی رۆژی پێنج‌شەممەرێکەوتی ١٤/٢/١٩٨٥ لە هۆڵی کۆمەڵەی رۆشنبیریی کوردی لە بەغدا سازی دەکەن ٠

لیژنـەی کۆڕەکە

نتشرف بدعوتكم لحضور الحفل التابيني لمناسبة اربعينية العالم الجليل المرحوم علاءالدين السجادي الذي تقيمه المؤسسات الثقافية والاعلامية الكرديـة في تمام الساعة الرابعة من مساء يوم الخميس المصادف ١٤/٢/١٩٨٥ وعلى قاعة جمعية الثقافة الكردية في بغـداد ٠

اللجنة التابينية

# منهاج الحفل التأبيني

**المقام على روح العلامة الجليل المرحوم علاء الدين السجادي في قاعة جمعية الثقافة الكردية ببغداد يوم الخميس المصادف ١٤/٢/١٩٨٥**

١ : تلاوة معطرة من آي الذكر الحكيم
٢ : كلمة الشيخ محمد طه الباليساني
٣ : كلمة المؤسسات الثقافية الكردية في القطر يلقيها السيد عبداللطيف عبدالمجيد گلي
٤ : كلمة الدكتور محمد شريف احمد
٥ : كلمة الدكتور احسان فؤاد
٦ : كلمة الاستاذ محمد جميل الروزبياني
٧ : كلمة الدكتور عز الدين مصطفى رسول
٨ : قصيدة للشيخ جلال الحنفي
٩ : كلمة الاستاذ جمال عبد القادر بابان
١٠ : كلمة الدكتور معروف خزندار ـ تلقى بالنيابة
١١ : كلمة الاستاذ مصطفى سيد احمد (نەريمان)
١٢ : كلمة الدكتورة شكرية رسول ابراهيم
١٣ : قصيدة اللواء المتقاعد عبد الرحمن المفتي
١٤ : كلمة السيد ممتاز الحيدري
١٥ : كلمة أسرة الفقيد

**لجنة التأبين**

# كلمة الشيخ محمد طه الباليساني

ليس من مات فاستــراح بميــت
إنــمـا الـمـيـت ميت الاحـيـاء
انـمـا الـمـيت من يعيش جهــولا،
كاسـفـاً بالـه، قليـل الـذكـاء

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

الحمد لله الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم ايكم احسن عملا، والذي جعل لكل بداية نهاية ولكل امر أمداً ولكل حي أجلاً. والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وعلى آله واصحابه الذين عاشوا بعزة وسيادة، وماتوا الى الحياة الابدية ذات نعمة وسعادة، وعلى والدينا والمؤمنين جميعا، ورزقنا تعالى صالح الاعمال في هذه الدنيا وفي الدار الآخرة الحسنى وزيادة، وما ذلك على آلله بعزيز.

أما بعد... أيها السادة

كتب آلله تعالى الموت على كل نفس منفوسة على وجه الدنيا فكل من عاش مات وكل من جاء فات. ولم يرزق الخلود لاحد من بني الانسان.

فلو كانـت الـدنـيـا تدوم لواحـد
لكـان رسـول آلله فيـهـا مخـلدا

تلك سنة آلله في عباده ولن تجد لسنة آلله تبديلا.

وفي القرآن الكريم: (كل نفس ذائقة الموت وانما توفون اجوركم يوم القيامة فمن زحزح عن النار وادخل الجنة فقد فاز وما الحياة الدنيا الا متاع الغرور). فطوبى ايها الاخوة: لمن ترك وراءه ذكراً حسناً وتراثاً خيراً ونافعاً، وحمل معه للدار الآخرة ذخيرة تقربه الى آلله تعالى وتورثه النعيم المقيم.

أيها الاخوة:

نحن اليوم في ذكرى أخ عزيز علينا بكل معاني العزة، وصديق حميم جداً وغالٍ وثمين، ذلك هو الشيخ علاء الدين السجادي الذي سخط على هذه الدنيا فتوجه الى الآخرة، واختار لقاء آلله على البقاء معنا فالتحق به. فعليه من آلله تعالى مالا ينتهي من الرحمة والاحسان ومنا الآف التحية والسلام.

أيها الاخوة...

لقد كان الفقيد رحمه الله تعالى أخاً عزيزاً وصديقاً ثميناً واستاذاً قديراً ومؤرخاً أميناً وعالماً ورعاً وشيخاً وقوراً ومتواضعاً وأديباً بارعاً ذا همة عالية ونفس زكية ذات إباء وشموخ.

أيها السادة...

لقد صاحبت الفقيد رحمه آلله تعالى فوجدته علاء في أدبه وعلاء في تواضعه وعلاء في سخائه وكرمه وعلاء في حبه واخلاصه وعلاء في عمله وأدبه وعلاء في كتابته وروايته وعلاء في قصصه واخباره. فبحق طابق الاسم المسمى، ولقد صدق مَنْ سماه علاء، ولاشك انه ألهم اليه هذا الاسم من آلله تعالى فلذلك جاء الرجل كما سماه أبوه علاء.

أيها الاخوة...

بالرغم من أن كل اخلاق الفقيد كانت فاضلة إلا أنه اعجبني من اخلاقه ثلاثة:

**الأول:** ـ قناعته فقد تعين رحمه الله تعالى أول ماتعين إماماً في مسجد صغير في الميدان يسمى مسجد الجيبه‌چي فعاش في ذاك المسجد الصغير المتواضع إماما فقط ولم يحاول يوماً من الأيام أن يضم الى إمامته الخطابة والتدريس كما فعل أقرانه وزملاؤه رغم ماكان يجد من الأهلية والسعة في العلم، وكان يسهل عليه ذلك حيث كان له اصدقاء كثيرون في المستويات العالية ومن المسؤلين الكبار كما لم يحاول النقل الى جامع كبير أو مكان شهير رغم أن مسجده كان متواضعاً جداً، وكان يسكن هناك في غرفة متواضعة حرمت من اشعة الشمس لاتدخلها لاضيفاً ولا شتاءاً، وكان على

الرجل الطويل أن ينحني فيها حينما يريد أن يقف قائماً.

**الثاني:ـ تواضعه**

**أيها الاخوة...**

كان الفقيد رحمه آلله تعالى متواضعاً. فلقد وجدته لسعة علمه وثقافته يراجعه الناس ويسألونه عن مسائل لغوية او علمية أو تاريخية، فكان يتكلم مع الطلاب كما يتكلم مع الاساتذة، ومع الغريب كما يتكلم مع القريب. ولقد اختير في الآونة الاخيرة أميناً عاماً للأوقاف في الحكم الذاتي فرأيت الرجل نفس الرجل في خلقه وبساطته وحلمه وتواضعه ولم يغيره هذا المنصب أي تغيير.

**الثالث:ـ هدوءه.**

ايها الاخوة. كان الفقيد رحمه آلله تعالى هادئاً في علمه وفي حركاته وسكناته، هادئاً في مشيته وجلسته، هادئاً في كلامه ومحاوراته، هادئاً في كل نواحي حياته حتى واصبح هادئاً في وفاته، فقد توفي رحمه آلله تعالى هادئاً دون أن يشعر به احد في مكتبته وعلى مصلاه مستقبلاً للقبلة تالياً لكتاب آلله العزيز وبعد اداء فريضته في ليلة الجمعة وقد ورد في الحديث الشريف:

«أن من مات في ليلة الجمعة أو يومها مات شهيداً»، فقد مات الفقيد شهيداً فعليه صلوات الله والملائكة والناس أجمعين.

**أيها الاخوة...**

إن رحلة الفقيد رحمه آلله تعالى والحق يقال لجسيمة ولمؤلمة جداً، الا أنه يخفف من آلآمنا أن الفقيد لم يمت فانه لايزال حيا في ضمير تلامذته وطلابه وفي قلوب أحبته وأصدقائه، بل وهو حي في طي ادبه ونكاته وبين أوراق كتبه ومؤلفاته في من خلفه من ابنائه وبناته وفقهم آلله تعالى.

فنرجو من الله تعالى أن يجمعنا في فراديس جنانه وان يحفه بمغفرته واحسانه وان يوفق اولاده للسير وفق سيرته ومنواله وللخوض في معركة الحياة بإيمان وتقوى وهدوء وان يمثلوا اباهم في كل ماتخلق به من العلم والادب والدين.

وٱلله الموفق وهو يهدي السبيل، والسلام عليكم ورحمة ٱلله وبركاته.

**محمد طه الباليساني**

# كلمة المؤسسات الثقافية الكردية في القطر

القاها السيد عبد اللطيف عبد المجيد گلي
مدير الهيئة الكردية في المجمع العلمي العراقي

أيها الحضور الكرام

نجتمع اليوم في هذا المكان لاحياء ذكرى فقيد الادب الكردي الاستاذ علاء الدين سجادي الذي وافته المنية مساء يوم الخميس ١٣ كانون الاول من العام المنصرم، وكان لرحيله المفاجيء صدى حزنٍ عميق في قلوب العلماء والأدباء وتلامذته الاوفياء. فلم يكن الاستاذ السجادي أديباً وعالماً لامعاً فقط، بل انساناً يحمل بيْن جنبيه قلباً كبيراً ومشاعر خيرة يشارك الجموع سراءهم وضراءهم فلقد قضى أستاذاً محاضراً في جامعة بغداد سنوات عديدة فكان يشارك الاساتذة تحمل الاعباء في سبيل النهوض بقسم اللغة الكردية فيها، وله بينهم مكانة متألقة لايستطيع أحد ان ينكرها، وكان مثابراً بنشاط في محاضراته التي ربى بها جيلاً من المثقفين الاكراد بين صفوف طلبته.

ويعد الاستاذ السجادي أحد مؤسسي المجمع العلمي الكردي الطيب الذكر، فقد أختير نائباً ثانياً لرئيسه الجليل منذ بدء تأسيسه عام ١٩٧٠ لحين دمجه مع المجمع العلمي العراقي الموقر، فكان عضواً فعالاً فيه أفاد المثقفين بتآليفه ونتاجاته.

وعندما اختير أميناً عاماً لشؤون الأوقاف في منطقة الحكم الذاتي أبدى الجهد الكبير لتوسيع المعابد والمعاهد الدينية في المنطقة والعناية بالأئمة والخطباء وتوظيف عدد كبير منهم ممن كانوا يعانون من شظف العيش.

ولقد كان متفانياً طيلة حياته في خدمة العلم والأدب فأحيا التراث، وأرخ الأدب، وألف في القواعد ودوّن في البلاغة وجمع مواد نصوص أدبية لأرشاد الكتاب والأدباء، ولم ينس ان يتحف القراء بمجلدات ضخمة من الطرائف والنوادر الكردية ليزيدهم خبرة بالعادات والأعلام الأدبية والجغرافية والامثال الكردية. وان اثره الخالد (تأريخ الأدب الكردي) الذي كان وسيظل عوناً كبيراً

للمثقفين الكرد في دراسة تأريخ أدب شعبهم، هو أول أثر من نوعه شمولاً ومنهجية، وقد دخل الأستاذ السجادي عالم الأدب الكردي من أوسع ابوابه بعمله هذا الذي سوف لاينساه باحثو تاريخ هذا الأدب وتطوره.

كما كان الاستاذ السجادي صحفياً لامعاً وكانت مجلة (گلاويژ) التي عمل فيها من البداية حتى النهاية مدرسة قائمة بذاتها جمعت على صفحاتها خيرة الكتاب الأكراد من مختلف الاتجاهات الثقافية والوطنية كما أنه أصدر مجلة (نزار) باللغتين العربية والكردية، فكانت لبنة اساسية لبناء صرح الأخوة العربية الكردية الشامخ رغم عمرها القصير. ان هذا الدور الثقافي المتميز الذي قام به الفقيد ليفرض على المؤسسات الثقافية والعلمية الكردية أن تضعه في الموضع المناسب، وتسعى لجمع مؤلفاته الكاملة وضمها الى بعضها لتبقى مصدراً رصيناً من مصادر الثقافة الكردية، وان تتابع ماكتبه الفقيد من تآليف لم يكتب لها النشر أو الطبع لتولي طبعها وبهذا تؤدي المؤسسات الثقافية الكردية في القطر دورها الحقيقي تجاه العاملين الذين أفنوا حياتهم في خدمة الثقافة والحضارة. فبارك آلله تلك المساعي التي قضى فيها عمره، فخلدته في حياته وبعد مماته على مر السنين.

# كلمة الدكتور محمد شريف احمد
# الى اسرة السجادي واصدقائه وتلاميذه

لم يكن الفقيد السجادي اول عظيم لنا يفقد، ولم يكن اول حبيب لنا ولكم يرحل، ولكننا فقدنا معه مالم نفقده مع غيره. فقدنا مدرسة قائمة بذاتها، ومثالا رائعاً للأدب والحكمة.

نبكيه لفقده في تأبينه رمزاً لرعيل قام ونهض، واستقام واستنهض. كتب تاريخاً لبني قومه، وترك تراثا غنيا لبني جلدته.

عرفته منذ اواسط الخمسينات، عرفت انساناً مؤمناً يعشق التأمل في الحياة واسرارها وفي الغازها، كان رحمه الله يحاورني كثيراً في فلسفة الحياة والموت ويجد البلسم في نسمة الايمان.

عرفته متديناً لايضيق صدره بالجاحدين بل كان يستقبلهم بنفس الروح الطيبة في صومعته، لم يتغير لافي نمط حياته، ولا في سلوكه وتعامله، ولا في تفكيره ونظره رغم تغير ظروف، وهبوب رياح عواصف في عقود من سني حياته.

كان رجل دين، ظل وفياً لسلكه الديني في وظيفته العلمية والسياسية والدينية وفي داره في شيخوخته. لم تنقطع صلته بمدرسته القديمة بل ظل يواصل الاستلهام الروحي في مطولات التراث العربي الاسلامي في البلاغة العربية والفلسفة الاسلامية كمطولات التفتازاني، والسكاكي، وعضد الدين الأيجي والسيد الشريف الجرجاني. ولمدرسته هذه اثر واضح في آثاره الخالدة في مؤلفاته الكردية ومحاضراته العلمية.

كان كرديا وانتم تعرفون ماقدم لكرديته، وكان عراقيا ويعرف العراقيون ماقدم لعراقيته.

لو كان لي حديث مع التراب الذي ضم جسده تحته لقلت له: اكرم ضيفك العزيز فطالما اكرم الناس.

لو كان لي حديث مع شباب مدرسته لأوصيتهم بالحكمة التي تجلت في عصاميته وواقعيته.

تذكرت اياما قضيناها معاً في الحكم الذاتي فدمعت عيناي فكانت الدمعة حسرة على الفراق وتعبيراً عن سعادة تلك الأيام الغاربة. وما زالت الدمعة تحكي الألم لفقد حكيم قلما يجود المجتمع بمثله.

واخيراً عدت الى عالم الغيب وطالما كنت متلهفا لادراك قبس منه.

فاخلد هناك «الا ان اولياء آلله لاخوف عليهم ولا هم يحزنون»

# چەپکێ ووشەی بەسۆز
# بۆ گیانی پاکی «سەججادی»

● دکتۆر إحسان فؤاد ●

● سەرلووتکەو بناوانی خەم

ئەڵۆی مردن کەمینی گرتووە، دانسقە هەر دەکوژێ
لەلایێ باوکە دەڕوا، لەلایێ خوێنی کوڕ دەڕژێ
گوڵی سووری چیای بەرزی وولاتم چەندە شیرینە
دەمی ناپشکوێ تاکوو لەتەکیا سینەیەك نەپژێ
خەمەو خەم رادەکێشێت، کانییە دەکشێت وەکو کاروان
بناوان و بناری هەردە سەرلووتکەی چیا دەمژێ!

● هەواڵی مەرگەو کزەبای پاییز:

کە هەواڵی کتوپڕی کۆچی دوایی گەیشت، ئێوارەیێکی درەنگە وەختی وەرزی پاییز بوو!

کزەباییێکی سارد لە شەقام و لە کەناری شۆستەکاندا نزیك ماڵی خۆیان سەروڕووی ئەو کۆمەڵە دۆست و ئاشناو برادەرانەی دەگرتەوە کە بەپیر ئەم خەمەوە هاتبوون.

دووا سەرنج دان لە ژووری نامەخانەکەیدا بوو کە لاشەی ساردو سڕی لێ داندرابوو. دیمەنەکە ئەوەندە کاریگەر بوو نمی فرمێسکی دەڕژاندە دیـدەی دۆستـانی نزیکـەوە، سەیـریـان دەکـردو دڵیـان بڕوای نەدەدا کە جارێکی کە رووە گەشەکەی مامۆستا (سەجادی) نابیننەوە!

رۆژی ماڵاوایی کردنی تەرمەکەی هەتاوێکی ڕوون؛ ڕوون وەکو ڕووی گەشی خۆیو شیرینیی زمانی. شەقام و درەختەکانی ڕۆشن دەکردەوە. ڕاستی، ئەم خەمە بەجۆرێ هەڵقولا کە کەس بەخەیاڵیدا نەدەهات. تەنیا پێش چەند رۆژێك مامۆستا سەجادی سەری لە کۆڕی زانیاری دابوو، لەتـەك ئەنـدامـان و ئەدیبـانی ئەو دەزگـایـەدا بێباك دانیشتبوو، گفتوگۆی

شیرینی بۆ کردبوون.

(سەججادی) خاوەنی دڵێکی فراوان بوو.. هەمیشە دەیویست بەپیر خەم و پەژارەی خەڵکی‌یەوە بچێت، لە کۆششی مەردانە شوێن دەستی دیـارە، کەچـی ئاوا بە هێـمنی‌و بە بێ‌دەنگی بێ‌ئـەوە کەسێـك تووشی کەمتـرین ئەزیـەت بکـات ماڵاوایی لێ کردین و بەجێ‌ی‌هێشتین! چونکـە ساکارێکی مەزن و بێ‌هەوا بوو هەرگیز لە مردن نەدەترسا.. کامەرانی‌و بەختیـاری‌ی لەیـاریـدەدان و خزمـەت کردنی گشتیـدا دەبینی بە بێ ئەوەی بەرامبەر بەم هەموو ڕەنجکێشانە چاوەڕێ‌ی هیچ جۆرە پاداشتێك بێت، یا چاوەڕێ‌ی دەستیاوێکی کۆششی ڕەنگینی بێت!

● **زامی کۆرپەی جوانەمەرگ و دڵی باوك**

فریشتەکان هاتن ووتیان:

ئێستاکە وەرزی خەزانە،

ئەم تەمە نارەوێتەوە،

ئێستا وەختی سەفەر نی‌یە

چاوەڕێ کە هەتاکو بەهار دێتەوە،

پیری دڵسۆز بزەیەکی قووڵ لێوی گرت

بەمەغزاو ژیر

تاقیمانەی پەنجا ساڵەی کەوتەوە بیر

ئەمین زەکی‌و پیرەمێردو ڕەفیق حیلمی‌ی بیرکەوتەوە،

نازداری جاف، قەلاچوالان،

خاك و خۆڵی بیرکەوتەوە

بەلایەوە ئەم پاییزە لەو پاییزە ئەشکینتر بوو

ئەم بەهارە لەو بەهارە ووشك تر بوو،

پەنجا بەهار هات و ڕۆیشت

چەندە مەست و چەندە شەنگ بوو

بەلام گوڵی سەیران و گەشت

تیایا هەر زامی سەرسنگ بوو،
ئیتر بۆچی چاوەڕێی وەرزی بەهار بێ؟
ئەسرین لە یادی (دانا)دا:
لەلای وەکو گۆمی مەنگ بوو
ئیتر بۆچی چاوەڕێی وەرزی بەهار بێ؟
پاییزێکی خەمگین لەناو دڵی ئەودا
لەچاوەڕوانیی بێهوودەی بەهارێکی ووشك و بێبۆن
بۆ کۆچکردن لەبارتر بوو.
(لاوان نەبن بەستە بڵێن بۆ گوڵاڵەی سووری بەهار
چی لە گوڵ کا دنیا دیدەی بەساڵاچووی دڵ بریندار)
زامی دانا لەناو دڵیا تەنیا زامی کوڕێکی جوانەمەرگ نەبوو..
زامی دانا کولانەوەی زامی هەموو نەتەوە بوو،
بیرخستنەوەی بەسەرهاتی جوانەمەرگی کۆرپەیەك و سەد (نەوە) بوو،
سەد هەزار زام لەسەر سنگی ئەو لاوە جوانەمەرگەدا
هەموو یەکیان دەگرتەوە..
سۆزو دڵی ئەو باوکە هەڵقرچاوەیان
بۆلای خۆیان دەبردەوە،
ووردە ووردەو ڕۆژ لەپاش ڕۆژ
وورەیان دەتاواندەوە،
ژینیان لەبەرچاو ڕەش دەکرد
فەدیان دەخستە ناو گرژیی گۆشەیەکی کەوانەوە!

* **کۆششی سەججادی لە چلەکاندا**

«کە لە ڕۆژانی شەڕو برسێتیو گرانیدا (گەلاوێژ)ی هەڵگیرسان»

تەم سەرملانی گرتووە
بارەش دەڵێ تەواو

خەم سەر دڵانی گرتووەو
هاژمدەکات بەتاو:
مەڵبەند سەهۆڵی ڕووت،
ئاسۆ کپ و مەلوول
میللەت کزو زەبوون
پێشێلی گەردەلوول،
لەم نووتەکا کە گشت زەمین
ڕووت و ڕەجال: شپرزەیە!
لەم مۆتەکا کە (تێن) یەك و (برسی) دەیە،
کێیە لە دامەنی چرا
کەوتۆتە بەر هەرا؟
کێیە لە کۆڕی خزمەتا
وا هەڵدەکا چرا؟
کێیە بۆ نەشمی تیپ
هۆگر بووە بە شەو،
چرا دەکات بە سۆز؟
سۆزیش دەکات بە کەو؟
کەوی خەیاڵ و سۆز، هۆنراوی بانی کێو
نمی ڕەزو بەهار، دووانی باغی لێو،
کێ بوو بە خوێنی دڵنیا
گەلاوێژی دەکرد بە نەخشی سەرچیا
کێ بوو وەکو سەپان، وەك ڕەنجی باغەوان
شەنوکەوی دەکرد (نیو) چەرخی ڕۆژگار؟
گوڵی دەچاند بە چنگ، دڕکی دەکرد بژار
کێ بوو وەکو تەتەر
دەرۆشت بە بێ‌ووچان؟
کێ بوو وەکو نەوەر

سەر بەرزو قارەمان؟
کێ بوو لە ئاردی نێو درِك یاقووتی کرد درەو؟
کێ بوو لە بەزمی لاووکا بەستەی دەگوت بە شەو؟
تەم سەرملانی گرتووەو، بارِەش دەڵێ: تەواو
خەم سەردڵانی گرتووەو، هاژە دەکا بەتاو
مەڵبەند: سەهۆڵی رِووت، ئاسۆ: کش و مەلوول
میللەت: کزو زەبوون، پێشێلی گەردەلوول
لەم نوتەکا کە گشت زەمین:
رِووت و رِەجاڵ، شپرزەیە،
لەم مۆتەکا کە تێر یەك و، برسی دەیە،
کێیە بۆ نەشمی تیپ
هوگر بووە بە شەو:
چرا دەکا بەسۆز
سۆزیش دەکا بە کەو
کێیە لە دامەنی چیا
کەوتۆتە بەر هەرا
کێیە لە کۆرِی خزمەتا
وا هەڵدەکا چرا؟

● ١٩٨٤/١٢/١٤ ●



مامۆستا علاءالدين سجادی
له سەرەتای هاتنه بەغدایا

## « عبــرات قــانيـات »

### ● جميل الروزبياني ●

زرت الاستاذ الشيخ علاء الدين السجادي في داره في الساعة الثامنة صباحاً من يوم الاربعاء الثاني عشر من كانون الاول لسنة ١٩٨٤م فوجدته لازماً الفراش مصاباً بزكام شديد (ضيّق نفسه)، فحاول النهوض فمنعته وطلبت اليه ان يركن الى الراحة، الا انه ابى ونزل بي الى الطابق الارضي، فجلسنا بضع دقائق نتبادل الحديث، فقال: قبل يومين اخذوني الى مستشفى ابن النفيس للقلب ظانيّن انني مصاب بخفقان فاجري لي الفحص والتخطيط، فظهر ان المرض الطاريء زكام شديد، ومع ذلك فقد طلب مني اليوم ايضاً ان اذهب الى المستشفى لنفس الغرض!» فرجوته ان يلبي الطلب ويخضع لنصح الطبيب وتركته مودعاً، فذهب الى المستشفى واجرى له الفحص ورجع الى المجمع العلمي لزيارة الاصدقاء، ثم عاد الى داره. ولم يدرِ احد ان هذه الزيارة كانت وداعية فرضتها الحاسة السادسة! ففي الساعة الثامنة والنصف من مساء يوم الخميس الثالث عشر من الشهر، وانا عائد من عيادة صديقي السيد عبد الرزاق الحسني المؤرخ العراقي العزيز على، تذكرت الشيخ علاء الدين السجادي فأدرت ارقام الهاتف للسؤال عن صحته!

فأجابتني ابنته الصغيرة قائلة: «مازال أبي مريضاً مرضاً شديداً» فطلبت اليها ايصال الهاتف اليه لاكلمه. وكان السجادي آنئذ قد دخل غرفة المكتبة لاداء صلاة العشاء، او لقلب صفحة من كتاب! ففاجأه الموت في المكتبة دون ان يدري به اهل بيته، فلما دخلت عليه ابنته الكبيرة وبيدها الهاتف وجدته قد فارق الحياة، فصاحت: «عماه! ادركنا فقد وافى الأجل والدي».

هنا تذكرت قول «شوقي» الشاعر الخالد:

«دقات قلب المرء قائلة له  ان الحياة دقائق وثوان»

هكذا فارق الحياة في مكتبته عالم كان همه نشر العلم والثقافة والأدب (انا لله وانا اليه راجعون).

ولد الشيخ علاء الدين بن الشيخ نجم الدين عام ١٩٠٧م، وهو ينتمي الى اسرة سجادي الكردستانية العريقة في الادب والعلم، وقد فقد والديه وهو يافع لم يبلغ الحلم بعد. فقطع صلته باهله واقاربه راحلاً في سبيل التعلم ليكون نفسه عصامياً فصدق فيه قول الامام الشافعي رحمه الله:

«رأيت العلم في جوع وذل وبعد عن الآباء والوطن»

«لو كان العلم اسهل خرف مابقي ذو جهل في الزمن»

حقاً كانت كردستان في القرون الماضية مدرسة دينية قائمة بذاتها ففي كل قرية امام ومدرس، يدرس الامام الصبية والمدرّس طلبة العلم. فدرس علاء الدين المقدمات في المدارس القروية حتى اصبح طالب علم ابتدائي (سوخته) فدرس في بالك وراوندوز سني ١٩١٨ الى ١٩٢١ ثم قصد بلدة السليمانية لتوسيع آفاقه الثقافية فحّل في عام ١٩٢٣م في مدرسة كان يدرس فيها «الحاج الملا رسول ديليژه‌يى» فدرس عليه تصريف ملا علي وفعل سعد الله، كما ذكر. ثم طاف على العلماء الاجلاّء في البلدة فتعلم وتثقف وتفقّه وصار عالماً دينياً فنال الشهادة (الاجازة العلمية). ثم قصد بغداد في الثلاثينات ليشبع طموحه فصار اماما في مسجد صغير وانزوى في مكتبته فبرز اديباً لغوياً، مؤرخاً صحفياً، ناقداً بلاغياً ومؤلفاً بارعاً ذا قلم سيال في كتابة الفكاهات الكردية وتأريخ الادب الكردي بنثر مسجّع يزيد القراء ولعا والجيل من طلابه شغفا، وعرف فضله ونبوغه حين تولى ادارة مجلة گلاويژ الثقافية خير ادارة. واصدر بلغة الضاد مجلة سماها «نزار» مختاراً هذا الاسم لافادة معنيين: فنزار تعني في اللغة الكردية «الروض الغناء الوارف الظلال» وتعني في العربية «العطاء والندرة» فدافع فيها عن الديموقراطية وحرية الفكر والقلم وايقظ فكرة الاخوة العربية الكردية. فألقم الدعايات الاستعمارية المفرقة حجراً.

كان الاستاذ السجادي (رحمه الله) رجلا طلق المحيّا، حلو المعشر، فكهاً، منكتاً، هادئاً، كثير الصمت. قليل الكلام، حسن الصوت محبا للموسيقى والمقامات في الخلوات. مجتهداً في اللغة الكردية متضلعا في اللغتين العربية والفارسية، خدم الادب الكردي واللغة الاسلوبية خدمة

ممتازة وانشأ جيلا جامعيا مثقفا، ولم يزل يتلذذ بالانزواء في مكتبته لانتاج مايرضي طموح الجيل المثقف حتى فجع بفلذة كبده «دانا» ابنه البار الذي استشهد في جبهة «البصرة» قبل وفاته بعام فغلبه الحزن عليه والبكاء والانين حتى كاد ان يشلّه ويضمجله ويحرفه عن مسك القلم ولمس القرطاس، الاّ ان رحمة آلله ادركته فوجد ان الطريق السوي هو في احياء التراث! ورغم انه كان منهوك القوى مغموما يتأوه عند ذكر ولده الفقيد وينفث حسرات زفرات الا انه استمر في اداء واجبه الوطني الانساني حتى وفاته فرحل وبين يديه اوراق كتابه النصوص الكردية والجزء التاسع من رشتەی مرواری..

واذا كانت يد المنون قد تلقفت في عام اربع وثمانين عالما عبقريا مثل توفيق وهبي وادباء نابغين من امثال «جگەرخوين» «والشيخ حسين خانقا» المتضلع باربع لغات وغيرهما فقد سلينا انفسنا بالتمثل بالاثر الخالد: «الموت يلتقط خياركم» وبقول الشاعر:

«الموت نقال على كفه جواهر يختار منها الجياد»

الا ان رحيل الشيخ علاء الدين السجادي فاجأنا دون توقع وانتظار فهزنا من الاعماق وزلزل كياننا، فنحن لمحزونون عليه تسكب عيوننا العبرات القانيات وتنفث قلوبنا الآهات الموجعات وليس لنا الا ان نعزّي الادب الكردي والادباء العراقيين والجيل الجامعي الذي نشأ، خير تنشئة تعزية من الاعماق مرددين قول الشاعر:

فلئن تصبك مصيبة فتجلد واعلم بأن المرء غير مخلد
ولئن ذكرت مصيبة تسلو بها فاذكر مصابك بالنبي محمد

رحم آلله علاء الدين السجادي رحمة واسعة وتغمده برحمته والهم ذويه واصدقاءه الصبر والسلوان. وشكراً...

١٩٨٥/٢/١٤



ماموٚستا علاءالدین سجادی
بە بەرگی نوێوە لە ساڵی ١٩٤٩دا

# وتاری دوکتۆر عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ

ووتیان مردی
ووتم چیای پیرەمەگروون
تەم :ایئەگرێو قەت نانەوێ
ووتم پاسەوانی
ووشەی کوردی ئیمە
هەر تاوێکە بێدەنگیی ئەو
بەڵام هەرگیز، نانوێ شەوێ
شۆرەسواری مێژووی ئەدەب
نەکۆڵ ئەداو نە ئەکەوێ.

بەڕێزان:

هەروا بەئاسانی سیروان ووشک ئەبێو خێڵ تاوێك ئەوەستێو هەر ئەوەندەی پێ ئەکرێ دەست بداتە شین و شەپۆر.

هەروا بەئاسانی کلیلی گەنجینەی گەلێکە نهێنیو پەنهانیی ژیانی گشتیو تایبەتی وون ئەبێو دڵسۆزانی سەر بەمیحرابی ئەو گەنجینەیە ئاهێکی ساردی بۆ هەڵئەکێشن و ئەیدەن بەدەم گێژاوی فەرامۆشیو لەبیر چوونەوەوە

ئەو سوجادی‌یە مەزنەی ئەمڕۆ بە کۆتەڵی ئەوەوە خەریکین ئەو سیروانەیە، ئەو گەنجینە پڕبەخشش و خاوەن نهێنی‌یەیە، کە زۆر داخی دڵ و ئاواتی بەکوڵ و هیوای سەرکەوتن و نهێنی ژیانی خۆیو خەڵکی لەپڕ بردە خاکەوە.

چەند هەفتەیە پێش کۆچی بێوادەی، لەگەڵ یەکێك لەو (زیندووکوژی مردووپەرستانە)دا کە ئێستا بۆ مامۆستا سوجادی دەگرین کەوتینە مشت ومڕ. پێی لێ هەڵبری، دەنگی لێ هەڵبری، دووایی کە ڕاستیو بەڵگە ئەکەوێتە قسە، کاسەی بێ ژێرکاسە دەکەوێو ئەوساو

ئێستاو لەمەودووا کۆتایی بریار دەربارەی ئەو ئاوارە تۆراوە مەزنە هەر ئەوەیە کە ئەڵێین:

- لە هەموو کوردێ زیاتری نووسی. هەرچی ی نووسی هەر شتی باش بوو. ووشەی کوردیی بەدناو نەکرد، نەیکرد بە کەرەسەی بەرگریی ناهەق لە کۆنەپەرستیو چەوساندنەوەو دوژمنانی گەل. بۆ کوردی نووسی. بۆ سەرکەوتن و نیشتمانپەروەریو پێشکەوتنخوازیی نووسی.

ئەو سوجادی‌یە مەزنە، کە یەکەم هەنگاوی لە ڕۆژنامەگەری‌یەوە بەرەو کتێب و کتێبخانەی کوردی نا، بە مەزنی دەستی پێ‌کرد.

بە «مێژووی ئەدەبی کوردی» دەستی پێ‌کرد. هەر لە سەرەتای ئەو بەرهەمە مەزنەدا جەوهەری ڕاستەقینەی خۆیی داینێو نووسی:

«ڕۆژێك شتێکم ئەخوێندەوە، کە لێ‌بوومەوە سەرلەنوێ لە دلی خۆما ووردم ئەکردەوە، لەمەوە کتوپڕ ئەوە هات بەبیرما کە ئایا من چیم؟»

پاش چەند پرسیار نووسی:

«بەڵکو کوردم. باشە کە کوردم ئەبێ لە نەتەوەی کورد بم، کە لە نەتەوەی کورد بووم ئەمەی تێ‌گەیاندم: کە کورد ناوی لە لاپەڕەی ڕۆژگاردا هەیەو ئەمیش قەومێکە بۆ خۆی. زۆری پێ‌نەچوو لە دەریای خەیاڵدا کەوتمە سەر ئەوە کەمیللەت مادام میللەت بوو بە بێگومان ئەبێ زمان و ئەدەبیات و تاریخێکی بێ، ئەگەرنەبێ‌بە هیچ ناژمێرریو هیچ نی‌یە، لێرەدا سەرم لێ تێکچوو. تەماشای خۆم ئەکەم سەیر ئەکەم تەنیا کورد نەبێ هەموو شتێکی‌ترم! کسپەیەك لە دڵمەوە هات، بەوە دڵی خۆمم دایەوە کە ووتم: بەڵگەی قەومی کۆنە زمانە ئەوا من هەمە، من لە نەتەوەی قەومێکم کە لە بەرە بەیانی تاریخەوە، بەم زمانە کە من قسەی پێ‌ئەکەم و پێ‌ی ئەنووسم قسە ئەکەن و هیچ کۆسپێك لای نەداون لە ڕێگەی خۆیان..».

سوجادیی مەزن بەم چەشنە باس لە خۆناسین و خۆدۆزینەوە ئەکات و ئەوسا لائەکات بەلای مێژوو و ئەدەبیاتی نەتەوەکەیەوەو هۆ و بەڵگەی

ڕووکردنە ئەو سامانە پڕشکۆیەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە.

بەڵێ سوجادی زۆر پێش ئەوەی ئەم چەند دێڕە بنووسی خۆی ناسیبوو. کە لەو شوێنەی چاوی تێدا هەڵهێنا هەر بە منداڵی کەوتە ئاوارەیی و کۆششی زانین و ژیانەوە، شاری سلیمانیی کۆڵەکە بۆ ئەو ڕۆڵە ئاوارەیە بوو بە مەفتەن و باوەش و هەر لەوێوە ڕێگەی بەرزبوونەوەو بوون بەم کۆڵەکەیی و کەڵەپیاوی‌یەی گرت و کە جارێکی‌تریش کەشکۆڵ و عەسای گەڕیدەیی هەڵ گرت و دوور لە کوردستان جێگیر بوو. دڵ و دەروون و هەستی هەر لەگەڵ هەموو نیشتماندا بوو. بەچەشنێ قۆڵی لێ هەڵکرد، کە تا مردن لە کۆشش و بەخشین نەکەوێ‌و هەموو نەتەوەی کورد بە بەخششی ئەو سیروانە مەزنەی جیهانی نووسین و جوان نووسین پاراو بکات.

ئەگەر بمانەوێ ژیانی سوجادیی مەزن و شەخسیەتی گەورەی ئەو لە بەندو فەسڵی باس و لێکۆڵینەوەدا جێ‌بکەینەوە، گەلێك سەر باسی گەورە گەورە دێتە پێشەوەو دەبێ بۆ هەر یەکەیان بەرگی کتێبێك تەرخان بکەین. بەڵام ئەوەی لە دروشمە هەمیشەیی‌یەکەی خۆی (دانا زانایە، زانا توانایە) زیاد ئەکرێ، ئەوەیە کە سوجادی لە هەموو نووسینەکانیا هەر ڕابەر بوو.

ـ گەلاوێژ. هەتا ئەستێرە بە ئاسمانی ڕۆژنامەگەریی کوردی‌یەوە بمێنێ، هەر درەوشەدارترین ئەستێرەیە.

ـ نزار ـ یەکەم گۆڤاری سیاسی ڕێگەپێ‌دراوی کوردی‌یەو ڕێبازێکی ڕاست و پاکی کوردایەتی و برایەتی و هاوخەباتی و پێشکەوتنخوازیی تێدا دیار بوو. ئەگەر سوجادیی نووسەرو زانا لە هەموو بەرهەمەکانیدا بدرەوشێتەوە، ئەوا بیری سیاسیی نیشتمانپەروەرانەی پێشکەتنخوازی ئەو پیاوە مەردە لەناو لاپەڕەکانی (نزار)دا بەلێکۆڵینەوەیەکی گەورە نەبێت هەقی خۆیی نادرێتێ.

کە بەری «فێنکی»ی نزاری لێ گیرا، هەوری چڵکن ڕووی لە گەلاوێژ گرت و پیرەمێردی نەمر هاواری کرد:

ئیبراهیم لەناو نارا سووتاوە
سوجادەی تەقوا بێ‌ڕایەڵ ماوە

ئەو دەمە بەووردیی سنعەتکارێکی مەزن و دڵسۆزی ئەو کوردە بەتوانایەی خۆی ناسیوە کەوتە بنهاد دامەزراندنی تەلار دووای تەلار بۆ زمان و ئەدەبیات و هەموو مەیدانەکانیتری بیر ڕووناکیی کورد.

- خاوەنی یەکەم مێژووی ئەدەبی کوردییە.
- لە کۆڕی ئەدەبیاتی گەشت و گەڕاندا یەکەم کتێبی کوردیی بەخشی.
- «ناوی کوردی»ی بە کتێب بۆکورد تۆمارکرد. تا کورد پێناسی خۆیان بەهۆی ناوی ڕەسەنی خۆیانەوە بچەسپێنن.
- چووە ناو دەریای فراوانی کەلەپووری نەتەوەو ئازایانە جبەو مێزەرەکەیی کرد بەقەڵغان بۆ ئەوەی سامانی بەرینی کوردو دیمەنی ئەتنۆگرافیو قسەی خۆشی نەفەوتێو هەمووی لەو هەموو بەرگە چاپکراوو چاپ نەکراوانەی. «ڕشتەی مرواری»دا بین بە بەڵگەی بەرزیو مان و مێژووو ژیان بۆ کورد.
- بەووردی لە شۆڕشەکانی کورد گەڕا. بەرهەمێکی ڕابەرانەی تێدا بەخشی کە لەپاڵ «مێژووی ئەدەبی کوردی» دا شایەتییەکی تر بۆ بیری ڕاست و ئاشکرای سوجادیی مەزن بدەن و بانگ بکەن.
- ئەوکەسەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهریو شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحمودی حەفیدو سمکۆو قازی محەمەد بە دەستەیەك و سەروەری یەك شۆڕش بزانێو هۆشیارانە شۆڕشی چواردەی تەمووز بە زادەی ڕەسەنی هەوڵی کوردیش بزانێ لە خەباتی هاوبەشدا هەر ئەو بوو کە ئەیوت: ئەدەبی کوردی یەك ئەدەبیاتی ڕەسەنی نەتەوەیەکەو بابەتایەرو مەلای جزیریو خانیو مەولەویو مەلای جەباریو سەییاقوو نالیو سالم و کوردی هەریەکە هەڵقەی یەك زنجیرەی یەکگرتووی ئەدەبیاتێکن کە حەمدیو ئەحمەد موختار جاف و زێوەرو بێکەسیان بەخشیوەو پاش نووسینی «مێژووی ئەدەبی کوردی»یش شاعیرانی تا ئەوسا زیندوو مەشخەڵیان هەڵگرتبوو و ئەو مەشخەڵە ناکوژێتەوە.
- هەر ئەو سوجادییە بیرووردو فراوانە کە دێتە ناو ژیانی کوردەوە، ئەبێ

دەربـــارەی بڵێین ـ کێ بێ دەنگی بڵنـــدی لەگـەڵ فەلـلاح و چەوســاوەی کورددا هەمیشە بەهارێك بێت کە هەر گەش و سەوزو بەخششدار بێت.

گەشتی نیشـــانـەدانـان بە ناو ژیـان و شکـۆو بەرزیی مامـۆستـادا زۆر پەلکەزێرینەی سەرناوی باس و سەرفرازیمان ئەداتێو ئەڵێ:

ئەو عەلائەدین سوجادی‌یەی چەرخی بەد لە منداڵی‌یەوە فڕێی‌دایە ناو گێژاوی سەختی کولەمەرگی‌و بێکەسی‌و بێ‌باوك و دایکی‌یەوەو دەبوو وەك هەزاران یا ملیۆنان منداڵی بێکەسی نەتەوە هەژارەکان ژیان بە کۆششی نان و گوزەرانەوە بەرێتە سەر، خۆیی گەیاندە پایەی یەکێ لە بلیمەتەکان و ئەستێـــرەکـــانی نەتـــەوەکـــەی خۆی‌و لە زۆر مەیـــدانی‌تـردا پلەو شەرەفی سەرئامەدیی وەرگرت. کە ڕووی‌کردە بەغدا لە خەیاڵیدا ئاواتی ئەوە هەبوو کە هەر لەم شارە دێرینەیەی کەلچەری ئیسلامدا ببێ بە مەلایەکی گەورەو وەك فەیرۆزئابادی‌و موفتیی زەهاوی‌و مەلای قزڵجی ناو دەربکات. بەڵام کۆڕو ڕۆژ و سەردەم و بزووتنەوەی نیشتمانپەروەری‌و ئازادیخوازانەی کوردو هەمـــو عیـــراق، ئاواتی لە دڵـــدا بەرزکـردەوە، بەڵام جڵەوی کاروانی بە شەقامێکی‌تری سەربەرزیدا برد.

بوو بە مەلا، بە مامۆستا ـ بەڵام لە جێی وەزع و ئیستیعارە وتنەوە، یەکەم کەس بوو لە مێژووی کورددا ئەدەبی کوردی بە قوتابیانی کورد بڵێتەوە.

گەشتی نیشـــانـەدانـان بە ناو ژیـان و شکـۆو بەرزیی مامـۆستـادا زۆر پەلکەزێرینەی سەرناوی باس و سەرفرازیمان ئەداتێو ئەڵێ:

یەکەم کەس بوو لەجێی تەلخیس و موتەووەل وتنەوە دەرسی بەلاغەی کوردیی وتـەوە. بەمـەشـەوە نەوەستـا، بۆ هەمـوو ئەم مەبـەستـانـە کتێبی خوێندنی کوردیی بۆ قوتابیانی زانستگا ئامادە کردو یەکەم ڕیزە ئیستیلاحی کوردیی بەلاغەت بەناوی مامۆستا سوجادی‌یەوە تۆمار کرا.

سوجادی مرد...

ئینسانێکی گەورەمان لەکیس چو، هەر سەرئامەدو نووسەرو زانا نەبوو،

بەڵکو ئینسانێکی گەورەیش بوو.

دڵپاك، دەروون پاك.. کەس نەبوو هێندەی ئەو هەموو خەڵکی خۆش بوێ‌و حەز بە خۆشی‌و بەرزی‌و سەرکەوتنی هەموو خەڵك بکات. لەخۆشیی هەموو خەڵکدا زەردەخەنەی بەختیاریت بەسەر لێویەوە دەبینی‌و لە ناخۆشیی هەموو خەڵکدا ماتەم دایدەگرت. وەك گەورە بوو بایەخی بە کاری گەورە ئەداو زۆر بە شتی بچووکەوە دڵی خۆی ئازار نەئەدا.

ڕۆژێك بێ‌و لاپەڕەی یادگار دەربارەی سوجادیی ئینسان تۆمار بکرێ، ئەوا هەر نواندنی ئەو شەخسیەتە مەزنە، گەشتێکی گەورەو بەرزی نووسینە.

جارێکی‌تر دەڵێمەوە: سوجادی کورد بوو، بەرزی‌و سەرکەوتن ویەکێتی‌ی کورد ئاواتی بوو. کوردی لە هەمووکەس خۆشتر ئەویست، بەڵام ڕق و کینەی بەرامبەر بە کەسی‌تر نەبوو. هەموو ئەم دیمەنانەش بە کردارو زمان ونووسینیەوە دیار بوون.

ئەی کورد: سوجادی ماڵئاوایی لێ کردین. بەڵام هەمیشە لەگەڵ لاپەڕەی نەمری مان و مێژووی کورددا ئەمێنێ.

دەنگی هەموو ئاوارەیەك ئەومان بیرئەخاتەوە.

هەموو بلیمەتێکی هەڵکەوتووی خۆپێگەیاندوو ئەومان بیرئەخاتەوە. لەگەڵ شنەی بای کوێستاندا هەست بە پاکیی دەروونی ئەکەین.

کە ئاوی زرێبار لە زەڵم ئەبێ بە تاڤگەو سیروان زەویی کوردستان پاراو ئەکات، وێنەی هاتن و بەخشینی ئەومان بیرئەکەوێتەوە. چیای بێستوون و شاهۆو پیرەمەگروون بەردەوامیی ئەومان لە کۆشش و خزمەتگوزاریدا بیرئەخەنەوە.

ئەی چەرخی بیستەم. چەرخی ئازادیی گەلان، کەخەریکی تۆماری پرشانازیت ئەدەیتە دەست چەرخی داهاتوو. لاپەڕەی گەلێك ڕۆڵەی خۆشت ئەکەیت بە پەیکەر. کاروانی کورد هەر بەڕێوەیە.

ئەگەر چەرخی پێشوو لە ساڵانی دواییدا ناوی حاجی قادری کۆیی بۆ

خۆی کردبێ بە پەیکەر، کاروانی کورد ناوی جگەرخوێن و عەلائەدین سوجادیی مەزنیش لەپاڵ چەند ناویتردا وەك چیایەکی بەرز ئەداتە دەست مێژوو.

سوجادی نامرێ. رێگەی ئەگرین. رشتەی رابەریی ئەو لە نووسیندا ئیبداع بە نەتەوەکەی ئەبەخشێ.

مامۆستا گیان:

له دڵی هەموو کوردێکدا ئەمێنی . . .

بەرزی، نەمری، سەرفرازی.

# في رثاء الشيخ :
# علاء الدين السَّجّادي

نُهىً ألق وفكر مستنيرُ ... وخُلُقٌ كالأقاح له عبيرَ
وطبع كالحرير وأين منه ... لعمر الله في اللطف الحرير
وصبر حين يطري صبر قوم ... فما يعزى الى ذلّ صبور
«علاء الدين» لست اقول قولاً ... أجامل فيه من طوت القبور
ولكن ماهناك من المزايا ... لأنت بمثلها أبداً حدير
رآك القوم منذ نبغت فيهم ... فتى لم يقترب منه الغرورُ
وعشت وفي ضميرك عن تعاطي ... مطالب ذلّ طالبها نفورُ
فان المرء ـ ماحسنت لديه ... من الدنيا صغائرها ـ صغيرُ
وكنت خفيف ظلّ غير كزٍّ ... يفيض على محيّاك الحبورُ
ولم يضحك لغدر منك ثغر ... وكم ضحكت على غدر ثغور
فقهت وان يمت فينا فقيه ... فيوم مماته يوم عسير
وليس اذا قضى رجل قدير ... بآتٍ بعده رجل قدير
وكان يزيِّنُ المحراب إمّا ... سجدتَ به أخو ورع وقورُ
وظلت نصير دين كان دوماً ... على الحدثان يعوزه النصيرُ
تحيّفناه حتى بات نضواً ... عليه كل ذي جور يجورُ
وهال الناسَ منا فرطَ جهلٍ ... جناحٌ من تناحرنا كسيرُ
ألا انَّ الفجيعة فيك جلّتْ ... وفيك مذاقُها صابٌ مريرُ
فان نفقدك نفقد فيك من قد ... غدا فينا لخُلّته شغور
وما نحجو رحاة الموت يوما ... ستمسك أن تدور فلا تدورُ
فليس من المنايا من مجير ... وأين يكون ذيّاك المجيرُ
رأيت الموت إمّا استبلَّ نفساً ... فما يجدي الشهيق ولا الزّفيرُ
ولا جدي النوادب فيه لطم ... وان دميت من اللطم الصُّدورُ
فان الله ورثه البرايا ... الى أن يخمد النَفَس الاخيرُ
وتلكم انصباء الناس فيه ... إناثهم سواء والذُّكورُ
وليس بدائم في الدهر حزن ... يطال به الانين ولا سرور

وإنّ عبـاد ربّـك ماتـغـنـوا فكـلـهـم لرحـمـتـه فقـيـرُ
وعـن يرثـيـك او ترثيـه ماضٍ به في إثـر من يرثي الـمسيـرُ
وللآجـال ماحـانـت نفـاذٌ شواهـده الـعشـايـا والبكـورُ
وخيـر الهـالكين أخـو فعـالٍ حقـولٍ فيـه من حَمْـدٍ كثيـرُ
وانّـك ذو خلالٍ طيّـبـاتٍ لدى يوم النُشـور لهـا نشـورُ
وسـوف تسُـر اذ سيقـوم منهـا غداة الـحشـر بين يديـك نورُ
وانـت وان نحفـت فريت فريـاً ضخـام النـاس عنـه بهم قصـورُ
فقـدمـاً قالـت الاعـراب قولاً له في كلّ مضـمـارٍ ظهـورُ
(تـرى الـرَجـل النحيف فتزدريه وفـي أثـوابـه أسـدٌ هصـور)

**الشيخ جلال الحنفي**
**بغـداد**
**١١/ ٢/ ١٩٨٥**
**(٢١ جمادى الأولى ١٤٠٥هـ)**



ماموّستا علاءالدین سجادی
به بەرگی کوردی‌یەوە لە ساڵی ١٩٥٦دا

# وتاری مامۆستا جەمال بابان

## مامۆستا عەلادین و ڕشتەی مرواری

**خوشك و برایانی بەڕێز!**

خوالێ خۆشبوو سەرەتای بەرگی چوارەمی ڕشتەی مرواری بەم ڕستەیە دەست پێ‌کردوە ئەڵێت: (بردمانەوە یان نا ؟) جا ئایا چی بردەوەو چۆنی بردەوە، ئەوە بەکورتی باس ئەکەین.

بێ‌گومان ئەدەب ئاوێنەی ژیانەو بەرزی‌و نزمی ئەدەب لە هەمو شوێن وسەردەمێکداو لەناو گشت نەتەوەیەکدا، پلەی پێشکەوتنی نەتەوەو دواکەوتنی پیشان ئەدا چونکە ئەدەب سەلیقەی ئەندامەکانی کۆمەڵ دەرئەخات، هەروەها پایەی زیرەکی‌و زەوقی گشت نەتەوەکە ئەخاتەروو. ئەمە جگە لەوەی ئەدەبی تایبەتی هەیە بۆ هەر نەتەوەیەك، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەدەبێکی گشتی جیهانی‌و عالەمیش هەیە کە نەتەوەکان و میللەتەکان تیدا بەشدارن. کوردیش مادام نەتەوەیە، ئەبێ ئەویش لەوجۆرە ئەدەبەدا، بەشی هەبێ‌و بیپارێزێ.

کورد خۆی لەخۆیاو بەگوێرەی خودو هەلکەوتی ولاتەکەی‌و بەهۆی مێشك ڕوونی‌و لایەنی نەفسی‌یەوە، قەومێکی گاڵتەچی‌و کەیفچی‌یە، سەرەڕای ئەوەش زۆربەیان قسەخۆش و قسەنەستەقن و ساکارانە قسەی‌وا ئەکەن هەر زۆر خۆش و پرمانان.

جا، دانیشتوانی بەڕێز: هەروەك ئەندامەکانی لەش دوای ئیش و کار پێویستیان بە حەسانەوە هەیە، مێشکیش پێویستی بە زاخاودان و خاوبوونەوەو پشوو هەیە، کە ئەویش هەر بەهۆی قسەی خۆش و نەستەق و پێکەنینەوە دێتەدی. ئێمە وەك نەتەوەیەك قسەی خۆشمان فرەیەو قسەخۆشیشمان زۆرە، بەڵام عەیبە عەیبە نەی‌هێشتوە ئەم بابەتە پیشکەش بکەین و بیکەین بە کتێب. ئەمە لە کاتێکدا کە نەتەوە پێشکەوتووەکانی جیهان هەر جۆرە شتیکیان بوویێت خێرا خستویانەتە سەر کاغەزو کردویانە

بە کتێب و بۆتە باغێکی پڕمیوە بۆ گەلەکەیان، بەڵام باخی گوڵەکانی ئێمە ڕوو لە سیس بوون و وشکەوەبوون بوون. خوالێخۆشبوو مامۆستا عەلادین گیانی کردەوە بەبەراو زیندووی کردەوە، کەسیش پێش ئەوو بەوجۆرەی ئەو کردی زاتی نەبـوو هەوڵ بدا ئەم ئەدەبـەمـان بپـاریـزێ. بەڵێ چەنـد تەقەلایەك دراوە بەڵام هەرگیز بەم ڕادەیە نەبوە.

بەکـورتی مامـۆستـا عەلادین نەیهێشت ئەم گەنجینـەی ئەدەبـەمـان بفەوتێ، هەشت بەرگی یەك لەدوای یەکی ڕشتەیمرواری بە فۆلکلورو قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و توانج و قسەی بەتوێکل پڕکردەوە کە لە کۆکردنەوەیدا ئەرکێکی هێجگار زۆری کێشا. لەگەڵ ئەوەدا کە (مەلا)و پیاوێکی ئایین بوو. هیچ سڵێکی لە توانج و تانەو تەشەرو ڕەخنەی نالەبار نەکردەوە، وەك خۆی ئەڵێت: «... زۆرکەس کەوتنە تەقەو دەستیان کرد بە ڕەخنەگرتن، بەڵام بەرەکەت دا. لەئەنجامدا ئەوانەی لە سەرەتاوە زۆر ڕەخنـەیـان لێ ئەگـرت، ئەوانـە زیـاتـر بەئـارەزوو بوون بۆ خوێنـدنەوەیو دەرچوونی بەرگیتری».

جا دانیشتـوانی بەڕێـز: گرنـگە ئەوەیـە کە مامـۆستـا ڕووداوەکانی وەك خۆیـان نووسیـەوە، چۆن لە دەم خەڵکـەکـە دەرچـوون، بەوجـۆرە خستونیەتە سەر کاغەز دەسا تام و چێژە کەشی لەوەدایە، جا ئەگەر بهاتایە هەنـدێ خاڵ و ژمـارەو قسـەیتـری بخستنایە شوێن، ئەوسـا ئەو نرخە ئەدەبییە فۆلکلوریەی نەئەماو ئەبوو بە قسەی نووسەر خۆی. ئەمەشی کە کردوە ئاگاداری کتێبەکانی (أغاني أبو الفرج الأصفهاني)و (عقد الفريدی ابن عبـد ربـه)و (المستطـرف في كل فن مستطـرف)ی شهـاب الـدين احمـدو کتێبـەپـڕگـالتـەو گەپەکەی (عوبیدی زاکانی) بووە، کە گەلێك لەو قسانە زیاتریان تیدایە کە لە ڕشتەدایەو ئەدەبەکەیان گەلێك (مکشوف)ترەو وەك لەیادم بێ لە سەرەتادا کەم کەس بەرگری لە مامۆستا عەلادین کردوە بەرامبەر بەو ڕەخنەگرانەو پشتیوانیی نووسینەکانی ئەکرد یەکێکیان مامۆستا جمیل ڕۆژبەیانی بوو.

بەهۆی سجادی‌یەوە نەبوایە، نەمانئەزانی خوالێخۆشبوان حاجی ئەحمەدی کورنوو، شێخ باباعلی قرەداغی، شێخ محمودی حفید، حەمەبەگی حاجی رسوڵ بەگ، مەلا سمایلی کانیسکان، ئەحمەدی عەزیز ئاغا، مستەفای حاجی برایم ئاغا، عەزیز بەگ، حاجی محمدی عەنبەر، شێخ قادری سیامەنسور، سەید ئەحمەدی خانەقا، عیزەتی فاتەی خولەدرێژ (عیزەت توپچی)، محمودبەگی جاف، خاڵەرەجەب، عبدالله ئاغـای حاجی حەمەسعیدو سەدەهای‌تر ئەم قسە خۆشانەیان بۆ بەجێ‌هیشتووین. ئەو نەبوایە نەمانەزانی زاتێکی وەك موفتی زەهاوی‌و مەولەوی‌و شێخ رەزای‌تاڵەبانی‌و فائق بێ‌کەس، کەئەمانە هەریەکە لە مەیدانی شیعرو ئەدەبا شۆرەسوارێك بوون، لەهەمان کاتیشدا قسەخوش و گالتەچی بوون : ئەوەتا لە مەولەوی ئەپرسن... باشە تۆ هەر ئەڵێی قەومەکەم خۆشیان ئەوێم، بەچیا ئەممان بۆ ساغ ئەکەیتەوە. ئەویش لە وەلامدا ئەڵێت: هەر ئەوە بەسە، کە هەورامیەك کەرەکەی مان ئەگرێت بەرەو ژوور سەرناکەوێ، خاوەنەکەی لێی ئەداو ئەڵێ هەچە دەی هەچە، بەخوا مەولەویش بیت سەرت ئەخەم.

لەوە زیاتر: ئەو قسە پرمانایەی کە لادێیەکی کوردی شارەزووری ئەیکات و بوە بە پەندیش: هەر کە لەگەڵ هاورێکەیدا پێکەوە بەدەشتێکی پر لە درك و دالا تێئەپەرن و هاورێیەکەی لێی ئەپرسێت: ئەری برا خوا ئەم گشت هەسان و چەورەسانەی لەکوێ هاوردگە ئەم درکانەی ئەئاوا پێ تیژ بکاتۆ. هاورێکەش لەوەلامدا ئەڵێت: برا ئەوە تۆ یێژی چی، ئەو هەر لەگەڵ فەرمووی تێژ تێژ. ئەم قسەیەو بەم سادەیی‌یە واتای تەواوەتی فەرموودە پربەلاغەتەکەی قورئانی پیرۆزە کە ئەفەرموی:

(إنّما أمْرُهُ اذا أرادَ شیئاً أنْ یقولَ لهُ کُنْ فیکونْ).

ئەئاوا مامۆستا عەلادین گرەوەکەی بردەوەو لەسەر دەرکردنی بەرگەکانی رشتە هەر رۆیشت و بێ‌وەستان تا گەیاندنیە هەشت بەرگ. هیچ دووریش نی‌یە، دوای خۆشی یەك دوانێکی دەستخەتی جێ‌هێشتبێ.

ئیتــر هەزار چەپکەگوڵی بۆنخـۆش و جوان بۆســەر گۆڕی مامـۆستـای مەزن. خواتان لەگەڵ.

# بیرەوەری و دڵۆپێك فرمێسك بۆ مامۆستا

● مارف خەزنەدار ●

سالی ١٩٨٤ کە دەستی پی‌کرد مامۆستامان تۆفیق وەهبی لە هەندەران و ئەودیو ئوقیانوسان لە لەندەن کۆچی دوایی کرد، تا ساڵ گەیشتە کۆتایی گەلێ شاعێرو نووسەرو هونەرمەندیشمان سەریان نایەوە. کە ساڵی ١٩٨٤ خۆشی لە ماڵئاوایی کردن نزیك بووەوە، بەلایەوە بەدبەختی بوو ئەگەر فرزەندێکی‌تری بەکار لە شاری بەغدا مامۆستا عەلائەدین سەجادی لەگەڵ خۆیدا راپێچ نەکا بەرەو مەڵبەندی مان و نەمان.

هەندێ پێش جەنگی گێتی‌ی دووەم لەکاتێك دا ئێمە پێویستیمان بە دەرچووانی قوتابخانەی تازە بابەت هەبوو، مامۆستا سەجادی دەرچووی حوجرەی کۆن و دوازدە عیلم و پێش نوێژ لە ڕێزی پێشەوە لەگەڵ دەرچووانی کۆلێجەکانی بەغدا وەستا. لە زۆربەی ئەوانیش باشتر بوو، چونکە ئەوان لە کۆلێجەکان هەموو شتیان دەخوێند ئەدەبی کوردی نەبێ، لەبەرئەوە کاتیان کەم بەدەستەوە بوو خەریکی ئەدەبی کوردی بن، کەچی مامۆستا قوتابخانەی گەلاوێژ و هەموو دەم و ساتێکیشی هەر بۆ ئەدەبی کوردی بوو، ماوەی نوێژەکانی لێ دەرچێ.

لەمەش سەیرتر ئەوەبوو گەلێ لە بابەتەکانی مامۆستا کە دەمیان لە ئەدەبی کوردی دەدا نەیان دەتوانی لە داوی حوجرە ڕزگاری‌یان بێ، کەچی نووسینەکانی مامۆستا هەر بۆنی حوجرەیان لێ نەدەهات.

مامۆستا دەورێکی دیاری هەبوو لە کۆواری «گەلاوێژ». لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە ئاگاداری ئەم کۆوارە بووم. هەموو ژمارەییکم دەخوێندەوە. دەمزانی مامۆستا کەسێکی دیارە لە گەلاوێژا. لەبەرئەوە هێشتا قوتابی‌ی پۆلی چوارەمی قوتابخانەی ئامادەیی کەرکوك بووم کە شتێکم بە کوردی نووسی، بۆ مامۆستام نارد. لەورۆژەوە منی ناسی.

مامۆستا بەتەمابوو ئاخری خێر بی‌و ڕۆژانی دوایی ژیانی لە خانووی تازەی بەغدای بباتەسەر، بەڵام بە شەهیدبوونی نۆبەرەی پشتی شکا.

لەوکاتەدا دووا بەرگی ڕشتەی مرواری لەژێر چاپدا بوو غەمی بوو، دەیووت: خەڵکی چیم پێدەڵێن ئەم کتێبە دەربچێ! دیاربوو کارەسات تا ئەورادەیە کاری لێکردبوو کە لە نووسین بکەوێ، بەڵام هەمووکەسیش دەیزانی کە کتێبەکەی پێش شەهیدبوونی نۆبەرەی کەوتبووە ژێرچاپەوە.

مامۆستا نەتوانێ بنووسێ، ئەمە نیشانەی کۆتایی‌یە. هەمووشت تەواو بووبوو. ئەوەندە هەبوو هەر نەفەس بوو دەهات و دەچوو و بەس، تا بوو بە میوانی شێخ ڕەزا.

دێڕێك و دوو دێڕ، لاپەڕەیێك و دوو لاپەڕە. کتێبێك و دوو کتێب بەشی ئەوە ناکەن کردەوەی نووسەری بەتوانای کورد عەلائەدین سەجادی پێ هەڵبسەنگێنن.

ئەم دێڕانە یادو فرمێسکی دڵسۆزێکی مامۆستان.

دڵۆپێك فرمێسك لە هەموو ئاوی زەریای ناوەڕاست تاڵترو سوێرترو سوورتر دەخەمە ناو هەندێ لەو مشتە خۆڵەی لە نیشتمانەوە لەگەڵ خۆم هێناوەو لە کیسەیێکی بچووکی دەکەم و دەیکەم بە قەڵێتەی مامزێکی لەوانەی دەشتی کاولە قەراجی دێرین و بەدیاری بۆ مامۆستا عەلادینی دەنێرم بەمەرجێ بە سەرانسەری ئەو خاك و نیشتمانە تێپەڕێ کە مامۆستا خۆشی‌دەویست. ئنجا لە گۆڕستانی شێخی گەیلانی بنیشێتەوەو گۆڕە پیرۆزەکەی پێ سوواغ بدا.

# پایەو مەقامی مامۆستا علاء الدین سەججادی لەناو کتێبخانەی کوردیدا

● مصطفی نەریمان ●

ساڵی ١٩٨٤مان ساڵی پرسەو ماتەم بوو چونکە لەو ساڵەدا هەندێ ئەدیب و نوسەرو رۆشنبیری وەك (ئەمینی میرزا کەریم، توفیق وەهبی، جگەرخوێن، حسین خانەقا، خاڵە رەجەب، حەبیب عەلی‌میرانی، طاهر صادق، علاء الـدین سەججـادی‌و محمـد فیـدا) کۆچی دوایی‌یـان کردو هەریەکەیان بەجۆرێك خزمەتی میللەتەکەمانیان کردووە، لەناو ئەم ناوانەدا مامۆستا (علاء الدین نجم الدین سەججادی) چل ساڵ پتر ژیانی خۆی لەپێنـاوی زینـدوو کردنـەوەی کەلـەپوورو نووسینەوەی مێژووی ئەدەبماندا بەخت کردووە، سەججــادی ساڵی ١٩٠٧ لەدایك بووەو بە فەقێ‌یەتی گەلێ ناوچەی کوردستان گەڕاوەو لە ناوەڕاستی بیستەکاندا هاتوەتە سلێمانی لە مزگەوتی بن طەبەق فەقێی حاجی مەلاڕەسوڵی دێلێژەیی بووە، وادیارە ئارەزوی زانست پەروەری مامـۆستـا سەججـادی لە سلێمـانی پاراو نەبـووە بۆیە لە سی‌یەکاندا هاتوەتە بەغداو بوەتە ئیمام لە مزگەوتێکی نزیك بە حەیــدەرخـانـە، ئەو سەردەمـەی مامـۆستـا سەججـادی هاتـوەتـە بەغـداد بزوتنەوەیەکی رۆشنبیری کوردی سەری‌هەڵداوە (کوردی‌و مەریوانی) دوانزدە کتێبیان چاپ کردووە، لاوانی کوردیش (یادگارو دیاری)یان بڵاوکردوەتەوە. (یانەی سەرکەوتن)یش لە چالاکیدا بوو. (ژیان) لە سلێمانی‌و (روناکی) لە هەولێـر دەرئەچـوون، سەججـادی پەیـوەنـدی لەگـەڵ رونـاکبیرانی ئەو سەردەمەدا پەیداکردووەو ئەوانیش کاریان تێ‌کردووە، لە دوا مانگی ساڵی ١٩٣٩دا گۆڤاری (گەلاوێژ) لە بەغدا هەڵات و تیشکی پرشەوقی چیاو هەردەو دۆڵەکانی کوردستانی روناك کردەوە، مامۆستا سەججادی ئاشنایەتی لەگەڵ بەڕێوەبەرانی ئەم گۆڤارەدا هەبوو. لەبەرئەوەی بەرێوەبەری گۆڤارەکە لە بەغدا نەما کاروباری گەلاوێژ خرایە ئەستۆی سەججادی‌و هەرخۆی کەرەستـەی بۆ کۆئـەکـردەوەو لە چاپخـانـەدا سەرپـەرشتی ئەکـردو پیتـاك و

ئابونەشی بۆ دابین ئەکرد.

سەججادی لە ساڵی ١٩٤٨دا شانی بەشان گەلاوێژ گوڤارێکی نیو مانگی رامیاری بەناوی (نزار)ەوە بە کوردیو عەرەبی بڵاوکردەوە، پاش ئەوەی بیست و دوو ژمارە لەو گۆڤارە دەرچوو، کاربەدەستان (گەلاوێژ) و (نزار)یان لە ساڵی ١٩٤٩دا داخست، پاش ئەوە مامۆستا دەستی دایە کتێب نووسین ئەوەبوو لەساڵی ١٩٥٢دا (مێژوی ئەدەبی کوردی) بەقەوارەی (٦٥٢) لاپەرە پێشکەش کردین کە تیادا وتویەتی (خۆم گەلێ بە بەختیار ئەزانم کە خوا یارمەتیدام و توانیم لە ماوەی چەندساڵێکدا بەکۆششیفیکرو ماڵی خۆم ئەم کتێبە کە مێژوی ئەدەبی کوردییە وەیا بە واتەیەکی فراوانتر دائرة المعارفی کوردییە بێنمە بەرهەم و پێشکەشی بکەم) لەدوایـیدا ئەڵێت (هێنام ئەدەبی کوردیم کرد بە کۆشکێك و بەدنیایەك بەڵام نەك کۆشکێکی دارو پەردوو، چونکە ئەوجۆرە کۆشکانە لەبەر پلاری گەرمای هەتاوی هاوین و سەرمای بەفری زستاندا خۆیان ناگرن، کردم بە کۆشکێك نە باکی بە کڵپەو بڵێسەی هەتاوی هاوین بێ نە بە تۆف و کریوەی بۆرانی زستان).

مامۆستای خوالێخۆشبوو بەدرێژایی سیوپێنج ساڵ کە ئیمامی مزگەوت بووە هەموو رۆژێك نێوان نوێژانی مەغریب و عیشا لە مزگەوتە بچکۆلانەکەیدا ئەدیب و رۆشنبیرو ناسیاوانی لەدەور کۆئەبونەوەو دەست ئەکرا بە گفتوگوو نوکتەو قسەی خۆش کردن. مامۆستامان ئەو هەلەی لە دەس نەئەدا ئەو قسەی خۆش و نەستەقانەی کە بەدڵ بوایە تۆماری ئەکردن و ئەچوو سەرلەنوێ دایئەڕشتنەوە. ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٥٧ەوە تا ساڵی ١٩٨٣ هەشت بەرگە کتێبی بەناو (رشتەی مرواری)یەوە لێ چاپکردن کە بوو بەجۆرە ئەدەبێکی زیندووی میللەتەکەمان.

مامۆستا لە ١٩٥٣دا سیارەبەکی ناوی کورو کچی کوردی پێشکەش باوك و دایکان کرد، لە ناوەراستی پەنجاکاندا گەشتێکی (١٨١٦) کیلومەترەیی بەناو کوردستاندا کردو ئەم گەشتنامەیەی کردە کتێبێکی

سەربەخۆ، کە شۆڕشی چواردەی تەمموزی ١٩٥٨ بەرپابوو هات شۆڕشەکانی بەدرخان و سمکوو حەمەپاشای ڕەواندزو شێخ مەحمودی لە کتێبێکدا بۆ لەچاپدان و هەڵوێستی کوردی بەرامبەر کۆمار دەربڕی.
سەججادی لە فولکلۆری کوردی‌یەوە سێ چیرۆکی لە کتێبی (هەمیشە بەهار)دا لە ساڵی ١٩٦٠ لەچاپ داو دەربارەی زمانیش لە ساڵی ١٩٦٢دا کتێبی (دەستورو فەرهەنگی کوردی) بلاوکردەوە.
لە ساڵی ١٩٦٩دا خوالێ خوشبوو لایەکی لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردی کردەوە بە کتێبی (نرخ شناسی) ئەو کەلەبەرەشی پڕکردەوە. پاش ئەوە بە سالێ جوانکاری‌یەکانی ناو ئەدەبی کوردی لە کتێبی (خۆشخوانی)دا خستینە بەردەست و دەربارەی ئەم دوو کتێبەی ئەڵێت:
هێنام ڕستەی خۆشخوانیم کرد بە ووشەیەك و کردم بە ناو بۆ ئەم کتێبە کە قسە لە ڕەوانبێژی‌یەوە ئەکات وەکو لەکاتی خۆشیدا ڕشتەی نرخشناسیم کرد بە ناو بۆ ئەو کتێبە کە باس لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی ئەکات.
ئەگەر بە شیوەیەکی گشتی بڕوانینە بەرهەمەکانی سەججادی دەبینین زوربەی زۆریان دەربارەی ئەدەبی کوردین و هەندێکیشیان لە خانەی کەلەپوورو فولکلۆردا دادەنرێن.
مامۆستا لە هەموو بەرهەمەکانیدا ئەمانەتی عیلمی پاراستوەو هەموو سەرچاوەکانی دیاری‌کردووەو لە نوسیندا شێوەیەکی‌نوێ‌ی گرتوەتەبەرو لە هەندێ بابەتە نووسیندا بە داهێنەر دەدرێتە قەڵەم.
لەو چل ودوو ساڵەی کە مامۆستا سەججادیم تیادا ناسیوەو تێکەلاویم لەگەڵ پەیداکردووە خوورەوشت و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی وەك نووکی قەڵەمەکەی خاوێن و بێ‌گەرد بوو. لە پاش ملە ناوی کەسی بە خراپە نەهێناوەو دڵی کەسیشی نەرەنجاندووە.
خوالێ خۆشبوو لە ماوەی سی‌ویەك ساڵدا بیستویەك کتێبی بە قەوارەی (٥٣٦٦) لاپەرە چاپکردووە ئەمەش ئەکاتە ٤٪ی کتێبی کوردی ئەوماوەیە، هیچ نووسەرێکی کوردمان بە قەوارەی کتێب نەگەیشتوەتە ڕادەی خزمەتی مامۆستا تەنها مامۆستای پایەبلند مەلا عبد الکریمی مودەڕیس نەبێت کە

به سێ هەزار لاپەڕە کەوتوەتە ژوور مامۆستای خوالێ خۆشبووەوە. سەرەرای ئەو هەموو بەرهەمە چاپکراوانە سەججادی چەند بەرهەمێکی حازرە چاپی بەجێ‌ماوە وەك (بەرگی نوێیەمی رشتەی مرواری)و (بەرگی دووەمی دەقەکانی ئەدەبی کوردی)و (کتێبی زیندەوەر) هەروەها رۆژانە بیرەوەری تایبەتی خۆی یادداشت کردبوو.

مامۆستای خوالێ‌خوشبوو ئەگەر شانازیی بە بەرهەمەکانی‌یەوەکردبێت قەت لەخۆ بایی‌نەبووەو هەوڵی ئەوەشی داوە بەرهەمی پوختترمان پیشکەش بکات، ئێمەی رۆشنبیرو ئەدیب و نووسەر ئەبێت لە ژینامەو خووڕەوشتەکانی مامۆستا کەڵك وەربگرین و بیکەینە مەشخەڵی خەباتمان لە گۆڕەپانی رۆشن بیریماندا بەمە روحی مامۆستا لە قەبرەکەیدا شادئەبێتەوە. خوا لە گوناهی خۆش بێ.



مامۆستا علاءالدین سجادی
لە ساڵی ١٩٦٢دا

# ماموّستای لەیادنەکردووم سەجادی!

● د. شوکرییە ڕەسووڵ ●

لە هەموو ژیانی خوێندنما قین و ڕقم لە هیچ ماموّستایەك نەبوّتەوە. هەمیشە خوّشم ویستوون و خوّشیان ویستووم. لە هەر قوّناغ و پلەیەکی خوێندنما ماموّستایوام هەبووە بەپێچەوانەی ماموّستا ڕەش بینەکەی گوّرانی شاعیر هەمیشە هانی خوێندن و ژیان لە بەرچاو شیرین کردن و خوّشەویستی خەڵکیو نیشتمان و زمانیان داوم. لە پلەی خوێندنی زانستگاشدا لەناو ماموّستا بەڕێزەکانمدا، لەناو هەموواندا، ئەوەی بەڕوویەکی خوّش و کورد ووتەنی (نورانیيەوە) ئەیروانییە قوتابییەکانی، ماموّستای بەرزو کوردپەروەر سەجادی بوو.

سەجادی نەك هەر ڕێزی منی بەتایبەتی ئەگرت، بەڵکو ڕێزی هەموو ئەو قوتابییە چاپوکانەی ئەگرت کە ئەڵهای نووسین و خویندنەوەو ڕێگای بەرەو هەورازی خوێندن بوون. زوّر جار پوّلەکەمانی بە نوکتەی (خاوەن دەق) خوّش دەکرد. لەگەڵ هەر دەقیکی پەخشانی هونەری کە پێی ئەووتین نوکتەیەکی بەتام و چێژی سلێمانیو هەولیرییانەی لەمەڕ ووشەی (ئەرێ بوّو ئەدی لوّ) وە بوّ ئەگێرایینەوە.

کەخوێندنیشمان تەواوکرد، ماموّستایانی بەشیکوردی لە (یانەی قوتابیاندا) کوّیان کردینەوە، شەرەفی قسەکردن بە توّ درا ماموّستای خوّشەویستم، هەر توّ بوویت لەناو ماموّستایان ئاموّژگاری پرسوودت کردین، ئاموّژگارییەکانت ئیستاش لەبیرمە کە ئەتووت:

پیاو خوّی سەری خوّی نەخورێنیٚ کەس نایخورێنی، ئیمەی کورد لەم ڕوّژەدا گەلیٚ هەلی چاکمان بوّ هەڵکەوتووە، با بوّ قازانجی تاکە نەفسی خوّمان سوودی گشتی نەدوّڕێنین، قەومی ئیمە بیٚکەسە، خوّمان نەبین بە کەسی کەس نابیٚ بە کەسی. جا ئاواتمە کە هەندێکتان پلەی بەرزی خویندن لەپیناوی خزمەتی زمانی کوردیدا تەواو بکەن.

بەڕێزم ماموّستا! ئەو ئاواتەی دوێنیٚ بوّت خواستین ئەمروّ هاتەدی.

بەلێ سەجادی گەلێ دەرسی پرواتای پێشکەش کردین کە کاتی خۆی زوو وەرمان گرت، بەلاّم ئەمرۆ لەگەلّ گەورەبوون و نەشو نومای بیرو هۆشماندا، لەگەلّ یادکردنەوەیدا، دەقی ووتەو ئامۆژگاریو کردەوەکانی لە مێشکماندا ئەزرنگێتەوە.

ئەی مامۆستای خۆشەویستم ! تۆ لام زۆر پیروزو پیرۆز بوویت، تۆ لەیادمدا ئەژیت و نەمردویت، تۆ ئەژیت، کردەوەو نووسینەکانت شاهیدی حالّن.

ئەی دلّسۆزی ووشەی ڕەسەنی پیرۆزی کوردی، ئەی خاوەنی مێژووی ئەدەب و فولکلۆرو ئەتنۆگرافیاو ڕشتەی مرواریو گەشتنامەو مێژوو و خۆشخوانی، ووشە لەئاستی پیاهەلّدانتا مل کەچە، هەر بۆیە هەستی دەروون و ڕازەکانمان بەئاشکراو روونی، بێ پێچوپەنا دێنە گوێ.

بە ڕۆیشتنت کەلێنیکی گەورەت لە کەلەپوری نەتەوایەتی بەجێ هێشت. خوات لەگەلّ، هەزار دروودو ڕەحمەت لە مەزارت، مالّ ئاوا، مالّ ئاوا، مامۆستای هێژاو بەرزم.

# چلەی خوالێ خۆشبوو مامۆستای نەمر علاء الدین سەجادی

عبد الرحمن مفتی

بە ناوی خودای گەورەو میهرەبان
سڵاوتان لێ بێ پایەبەرزەکان
ڕۆشنبیران و خاوەن خامەکان
زاناو دانایان هەموو نووسەران
خوشك و برایان خۆشەویستەکان

لەپێشەوە داوای لێبووردن ئەکەم کە چەند کاتێك سەرتان دەیەشێنم [لەم کاتە زۆر بەنرخ وگرنگە] کە نابێ [یەکێکی] وەکوو من بەخۆڕایی لەکیسی بەرێ چونکە تەرخان کراوە بۆ:ـ
زاناو دانایان خاوەن خامەی جوان
بۆ بلیمەتان بۆ ڕۆشنبیران
بۆ نووسەران و دەستەی شاعیران
بۆ (پەری) پەنجەی دەس هونەرمەندان

بەڵام بەداخەوە چارم ناچارە، بەزۆرە ملی خۆم، خۆم لەم کۆڕە پیرۆزە تێهەڵقولتان..... ئەمەوێ [بولبولی] گیانی [ماموستای نەمر] کە ئێستا وا بەسەرمانەوە فرك و هووریەتی چاوی لێمانە.....
یەکەیەکە بەسەرمان ئەکاتەوە.... منیشن ببینێ کە قوتابیەکی خۆی بووم لە چلەکان بەدواوە... هەر هانیئەدام بۆ نووسین، بە وشەی پاك و جوان...
هەر لەبیرم ناچێتەوە [شایەتیشم گۆڤاری گەلاوێژی بەنرخە] کە لەزۆریا نووسین و شیعری منی بڵاوکردۆتەوە... ئەمەش [شانازییەکە بۆ من].....
ئیتر لەوساوە [قەڵەم وپێم] لێ نەبریوە هەتا مانگێ پێش کۆچی دوایی

له ماڵی خۆیان باسی ئەوەی بۆ ئەکردم کە چۆن دەرسی [گەلەنبەوی] لەلای موفتی باوکم خوێندوە. . .

ئەمجا لەبەر ئەو هۆیەو هۆیەکی‌تریش تۆزێ [سکالاَی] خۆم بکەم، لەگەڵ ئێوەی بەڕێزیشدا بەشدار بم. . . [تابرینی بولبولی دلی زامارم] بە [مەرهەمی] وتەو وشەی جوانی ئێوە تیمار بکەم [بە بەرچاوی ئێوەو گیانی پاکی مامـوستـای نەمـرەوە]. . . . چەنـد [دڵۆپێ] فرمێسکی خوێناوی کە لەنـاخی دڵ و دەروونـەوە [هـەڵقـولاَبێ و هەڵچێ]، بڕێـژم بەڕووی زەردو زەبوونما. . . لە ڕۆژی چلەی مامۆستامان علاءالدین سەججادی. . . کە کۆستێکی زۆر گەورەو گرنگ بوو لە گەل و نیشتمانەکەمان کەوت. . . بە کۆچی دوایی نەمر [گوڵی بۆن خۆش و جوان و ڕەنگاو ڕەنگی ئەو] لە گوڵـزاری ئەدەبـا وشـك بوو. . . ئەستێـرەی گەشی لەئـاسمانی وێژەدا کشاو، لە ئاسۆی زانیاریدا ئاوابوو. . . . .

[هەموو گوڵی ئەو گوڵزارە] لەعاستی خۆی سیس بوو. . . .
لاسکەکانی چەمایەوەو لوول بوو. . . .

پەڕەکانیان بەسەر گڵدا پەرش و بلاَو بوو. . . . [هەڵپرووزان] بە گڕی ئاگری کۆچی هەتاهەتایی گیانی مامۆستامان ڕەش و ڕووت و زەرد بوو. . . چاوەڕێی (شەونمی) بەهاری ژیانێکی نوێ ئەکەن کە بباریٚ بەسەریاندا [تەمی تەڕی] هەڵسابێ لە (کانی) کانگەی (ئەدەب)، بە خامەی جوانی ئەدیبـانی گەلـەکـەمـان و پاشمـاوەی ئەو نووسینـانـەی مامـۆستای نەمر کە نەکەوتۆتە بەرچاو هێشتا هەروەکوو مرواری. . چەشنی (ڕشتەی مرواری) بباریٚ بەسەریانداو بگەشێنەوە. . . . [گوڵزارەکە] هەروەکوو خۆی لێ بێتەوە. . . .

ئیتر نازانم چی‌بڵێم دەربارەی ئەم کۆستە گەورەیە کە لێمان کەوت!!!! هەرچی بڵێم هەر کەمە [دڵۆپێکە لە دەریایەك]. . . لە وزەی مندا نی‌یەو نازانم، نە بە زمان، نە بە خامە، ناتوانم [مافی خۆی بدەمێ]. . . . .

برادەرانی خاوەن خامـەو بلیمـەتـەکـان هیچیـان بۆ من نەهێشتـەوە [هەرچیەك بڵێم دووبارەیە]. . . [دوو بارەش ئەدیبانە نیە]. . . . .

ئەوا بەم چەند شیعرە کۆتایی بە وتەکەم ئەهێنم، کە ئەویش هەر هیچ نیە
بەڵام دڵی خۆمی پێ خۆش ئەکەم هیچ نەبێ.....
لە خوای گەورەش ئەپاڕێمەوە کە پەلەوەری گیانی مامۆستا،
[لە بەهەشتی ژووروودا: هەروا ئەم چڵ ئەو چڵ کا]
دڵنیاش بێ گەلەکەی لەبیری‌ناچێ یادەکەی
ئەوەی بێتە دنیاوە ناژی بەئارەزووی خۆی
هەتا ئەڕوا هەر ژانە کوێرەوەری میوانە

## ـ شیعـــرەکـــان ـ

گیانی علاء الدین سەجادی بە بەهەشت شادە

٩١ + ١٠٢ + ٩٥ + ٨٣ + ٧٢٤ + ٣١٠ = ١٤٠٥ کۆچی

ئەم عینوانی شیعرانە [ساڵی کۆچی] مامۆستا علاء الدین دەرئەچێ بە ژمـارەی ئەبجـەد بە مێـژووی کۆچی کۆیبکـەروە ئەکـاتـە [١٤٠٥] دەق ساڵی کۆچیەتی خوا لێی خۆش بێ.

نەمدی من ڕۆژێ دەرکی خەم خڕ بێ دەروون بێ‌خەم بێ
پارۆیکی ڕەحەت بەرم بۆ دەمم یا لەناو دەم بێ
ئەوکاتەی ئەنووم خەو بێ لە چاوم سەر لە سەرین بێ
دوو پرخەی بۆ بکەم بە ئارەزووی خۆم دڵیش ڕەحەت بێ
**نەمدی من ڕۆژێ دەرکی خەم خڕ بێ دەروون بێ‌خەم بێ**

زڕەی تەلەفۆن نیوەشەو لێ‌ی‌دا ڕاچڵەکی (دڵم)
نام بەگوێمەوە هەنسکی ئەدا گورج وەستا (دڵم)
ووتم بیڵێ زوو چەبوو چەقەوما تەقی‌کرد (دڵم)
ووتی [سەجادی] کۆچی دوایی‌کرد پچڕانی (دڵم)
**نەمدی من ڕۆژێ دەرکی خەم خڕ بێ دەروون بێ‌خەم بێ**

ئیتر کە بیستم مامۆستای ئەدەب کۆچی دوایی کرد
زامی کۆنونوێم وا هاتە سوێ لێم لە [دڵ] کاری کرد
ئەستێرەی گەشی [مێژووی وێژەمان] کشاو باری‌کرد
هەمووی داخ کردین بە ئاگری کۆچی ماڵئاوایی کرد
نەمدی من ڕۆژێ دەرکی خەم خڕ بێ دەروون بێ‌خەم بێ

سەر لە بەیانیم تاکو ئیوارە شەوەهای شەوم
گریەو فوغانە هاوار هاوارە ئەبەد ناسرەوم
ژینێ گەر وابێ تووخودا با نەبێ با لە پی کەوم
نەزانم من چیم لەهیچا کە نیم شوێنی چی کەوم
نەمدی من ڕۆژێ دەرکی خەم خڕبێ دەروون بێ خەم بێ

ئەی چەرخی چەپگەرد لە دین بێ‌بەری هەتاکەی بەسیە
مۆڵەتم نادەی تۆزێ لێم گەڕێی خەمخواری بەسیە
منیش وەك خەڵکی دەرفەتم بەرێ دەردەسەر بەسیە
چاوێ هەڵ بێنم بڕوانم قەدرێ دەی زالم بەسیە
نەمدی من ڕۆژێ دەرکی خەم خڕبێ دەروون بێ‌خەم بێ

خۆ کفرم نەکرد کە دام بەگوێتا چەند سکالایە
وا گەمارۆت دام قینت لێم هەستا کردتە هەڵلایە
لەترسا کەوتم بێ‌هۆشت خستم دەنگم دەرنایە
ووتت ئەتکوژم خوێنت ئەڕێژم لاچۆ لەم لایە
نەمدی من ڕۆژێ دەرکی خەم خڕ بێ دەروون بێ‌خەم بێ

هۆشم هاتەوە
ووتم هەتا کەی
تۆ کەست نەهێشت
تۆزێ شەرمت بێ
**نەمدی من ڕۆژێ**

هاتمە زمان لێ ی
شەن وکەو ئەکەی
لەزاناو دانا
تیایا بێڵەوە
**دەرکی خەم خڕ بێ**

قیروسیام لێ کرد
پرسیارم لێ کرد
قەلاچۆت لێ کرد
دنیات وا لێ کرد
**دەروون بێ‌خەم بێ**

چرای گەرچەکت
بەشوێن ئەوکەسەی
بە ڕۆشنبیری
تۆش ئامادەی چاك
**نەمدی من ڕۆژێ**

وا بەدەستەوە
کە گیان فیدایە
بۆ ڕێگای ژیری
بۆ گیان کێشانیان
**دەرکی خەم خڕ بێ**

کاکی بەکاکی
بۆ گەل و خاکی
بە خامەی پاکی
زۆر بە بێ‌باکی
**دەروون بێ‌خەم بێ**

زانایەك مابوو
جگەر سووتاو بوو
دەك بشکێ دەستت
ئێمەشت خستە
**نەمدی من ڕۆژێ**

هیوای گەلمان بوو
لە خوێنا غەرق بوو
هەڵوەرێ پەنجەت
کۆڕی ماتەم و
**دەرکی خەم خڕ بێ**

ئەویشت هەر برد
گیانیشت دەرکرد
بۆچی وەهات کرد
گەلت هەتیو کرد
**دەروون بێ‌خەم بێ**

کوردی قوڕبەسەر
هەوری نەگبەتی
دایکی [نیشتمان]
ئەگری‌و ئەناڵێ
**نەمدی من ڕۆژێ**

گوناهی چیە؟
نارەوێتەوە
دائیم ڕەش پۆشە
جگەر برژاوم
**دەرکی خەم خڕبێ**

(خۆشی) (ماتەمە)
ڕۆژی وا (تەمە)
خۆراکی (خەمە)
بێژنگ (سینەمە)
**دەروون بێ‌خەم بێ**

[شێرۆ]ش بە گریان گەڕا بۆ [پیرێ] [پیری]خیرەد بێ
کە لێ‌ی بپرسێ بۆ مێژووی [کۆچی] هەتا لێ‌ی فێر بێ
دەرچوو بەئەبجەد [پیتی خالداری] ئەم نیو شیعرەی دێ
[خوایش ئەمری وای‌کرد] [ڕۆحی سەی‌عەلای] [بەهەشتی‌و شاد بێ]

۱۹۸٤ = ۳۱۲ + ۷۱۲ + ۳۰ + ۲۰ + ۹۱۰

نەمدی من ڕۆژێ دەرکی خەم خڕ بێ دەروون بێ‌خەم بێ

ماموستای نەمر جێگەت بەهەشت بێ

# چلەی نەمریی سەردەستەی ئەدیب و زانایانی کورد: حەزرەتی سەجادیی مەزن

● ممتاز حيدري ●

لەوەتی. ئەو پارچـە زەوی‌یـە هەرە جوانـەی کە جەرگـەی زەمینـەو ناونـراوە کوردنشین. . بۆتە یاریگەی تۆپێنی ئەم و ئەو، ئەو خاکەی لە دێرزەمانەوە بە فرمێسك و خوێن و خەم شێلراوە، بۆتە مەیدانی زیندەبەچاڵ و سەربرین. . . ئەو نیشتمانەی بۆتە گۆڕەپانی لەشکری هەر چوارگۆشەی جیهان. . بەڵێ لەو وڵاتـەدا کە قسـەو زمـانی زگمـاك دروست بووەو نووسین و خوێنـدنی کوردی سەری هەڵداوە. . ڕێچکەی شاخاوی وشەی ڕەسەنی کوردی بە کۆشش و شەونخـوونی بێ هاوتـای سەدان کەڵـەشـاعیرو ئەدیب و ڕۆژنامەنووس و زاناو نووسەری دڵسۆزو لێهاتووی نەتەوەپەروەرو نیشتمانپەروەری کورد تەخت بوە، بگـرە ئەم ڕێچکـەیـە چەنـد تەخت بوە ئەوەنـدەش زیـاتـر دۆڵی خەم و ژان قووڵترو درێژتر بوە، بەڵکو هەوێنی مێژووی ڕەوتی ئەدەبی و ڕۆشنبیری کوردی خۆی لە خۆیـدا ڕوبـارێکی گەورەی ئارەقـەو فرمێسـك و خوێنـە. . لەگـەڵ ئەوەشدا سوارچاکەکانی مەیدانی وشەی ڕەسەنی نەتەوەیی و مرۆڤ پەروەری کوردی کە مەشخەڵی شەوەزەنگی نەتەوەو ژیان بووینە، هەردەم دڕیان بە ڕۆژگـاری هارو دژوار داوەو قەڵـەمـە پاك و تیـژەکـانیـان هەمیشـە خەنجەری دەبانی سەرسینگی ئەغیار بووە بە واتایێکی وردتر ئەو کۆمەڵە شۆڕەسوارانەی کورد، وەك:

«بابە تاهیر، مەلای جزیری، بێسارانی، ئەحمەدی خانی، نالی، سالم، مەولـەوی، حاجی قادری کۆیی، مقـداد مەدحـەت بەگ، عەبـدوڕەحمـان بەگ، ئەحمەد موختار، حوزنی موکریانی، محەممەد میهری، شێخ نووری شێخ سالح، ئەمین زەکی بەگ، ڕەفیق حیلمی، سالح زەگی ساحێبقران، عەبـدولـواحیـد نووری، سالـح قەفتـان، مستـەفـا پاشـا یامـولکی، مەحوی،

وەفایی، نەجمەدین مەلا، مەلا شەریف عوسمان ڕەنگەڕەژانی، بێکەس، پیرەمێرد، مستەفا شەوقی، دڵدار، تۆفیق وەهبی، عەرەبی شامیلۆف، عەبدوڕەحمان زەبیحی، گیوی موکریانی، مەعروف قەرەداغی، عەبدوڵڵا جەوهەر، یەلماز گونەی، جگەرخوێن، محەمەد عەلی عەونی، گۆران، تادەگاتە سەردەستەی ئەدیب و ڕۆژنامەنووس و زانایانی کورد مامۆستا سەجادی‌ی پسپۆڕی مەیدانی دوازدە زانستی هاوچەرخ. ئەمانە هەموویان مێژووی شکۆمەندی ئەم ڕێڕەوە درێژخانەیەی ژیانی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەنووسی ئەمڕۆکەو دوارۆژمانن.

بەڕێزان:

که دەڵێم مامۆستا عەلائەدین سەجادی سەردەستەی ئەدیب و نووسەرو زانایانی کوردە لەبەر ئەوەیە چونکە کەس وەکو ئەو لە ڕێگای خوێندن و ژیانی مەلایەتی‌یەوە نەیتوانیوە بیست بەرهەمی شاکار زیاتر بە ئاکام بگەیێنێ و ئەو شاکارانەش چەندین مەیدانی ئەدەبی، مێژوویی، کەلەپووری نەتەوایەتی، زمانەوانی، ڕەخنە، کۆمەڵایەتی، لێکۆڵینەوە، ڕۆژنامەنووسی، فەرهەنگ، گەشتنامەو ڕۆشنبیری گشتی بگرنەوە.

هەر بەرهەمێکیش لەو بەرهەمانە خۆی لەخۆیدا نیشانەی دڵسۆزی و لیهاتوویی گیانی نەتەوەپەروەری ئەدیبێکی گەورەیە یان زانایێکی پسپۆڕە، یاخود مێژوونووسێکی پشوودرێژ و وردبینە، یا وەك ئەندازیارێکی گیانی و حەکیمێکی دوڕناسە، بگرە لەوەش زیاتر تەنیا بەڵێ تەنیا کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی تێکڕا سەرجەمی ئەو مەیدانانە هەمووی دەگرێتەوە... مشتێکی خەرواری ئەم کتێبە مەزنە وەك نموونە نەك وەك لێکۆڵینەوە دەخەمە بەرچاو ئەویش بریتی‌یە لە پێشەکی ژیانی ئەو (٢٤) شاعیرە گەورەیەی کورد کە مرۆ دەوریان دەکاتەوە وا هەست دەکات مامۆستا سەجادی لە ناخی ناخەوە لەگەڵیان ژیاوە، وەك ئەندازیارێکی گیانی و زانایێکی دەروونناس زۆر بە وردی پێناسی گیانی و هەست وسۆزی شیعری و ڕێبازی ئەدەبی و ڕوانگەی بۆچوونیان دەستنیشان دەکات. بگرە ئەم ٢٤ پێشەکی‌یە خۆی لەخۆیدا ئایەتی ئەدەبی و

هونـــەری‌و ڕەوانبێــژی‌و جوانکـــاری‌ی پەخشـــانی کوردین کە پێــویستـــە لە قۆناخەکانی خوێندنی کوردی بخوێندرێن. . !

دیسان دەربـــارەی ئەم کتێبــە ـ واتـــە مێـــژووی ئەدەبی کوردی ـ دەڵێم تائیستاکە کەس نەیوێراوە خۆی لە قەرەی ئەم شاکارە مەزنە بدات، نەك بە وردی هەڵیسەنگێنێ بەڵکو تەنیا پێیدا بچێتەوە. . !؟

لە لایەکی دیکەوە دەربارەی چۆنیەتی‌و ماوەی دانانی ئەم کتێبە خاڵێکی دیکەش باس دەکەم ئەویش وەك سەرنج وەدەست هێنانە لە خودی کتێبەکەوە چـــونکـــە من هیـــچ چەشنـــە زانیـــاری‌یێکم لەبـارەوە نی‌یـە. ئەم خاڵـەش نیشانەیێکی گەورەی گەورەیی‌و نەتەوەپەروەری مامۆستا سەجادی‌یە! حەزرەتی سەجادی لە پیشەکی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا دەڵێ:

«دەمێ ساڵە، بگرە ئەوەتی هۆشم کردۆتەوە لە کانگای دڵەوە حەزم لە ئەدەب و ئەدەبیـــات کردوە، بەوبـــۆنـــەوە گەلێ جار خێم ئەدایـە خوێنـدەنەوەی ئەوشتانە کە ئاشنایەتی‌یان بە ئەدەبەوە هەیە، بەتایبەتی هینەکانی ڕۆژهەڵات چ عەرەبی، چ فارسی، ئەمە بێجگە لە ئەدەبیاتی ڕۆژاوا ـ جۆش و خرۆشێکی ئەدامێ‌و ئەیخستمە عالەمێکی‌ترەوە. ماوەیەکی باش ئەمە ئیشم بو بە بێ ئەوە بچم بەلای بیروباوەڕێکی‌تردا! . .

«ڕۆژێك شتێکم ئەخوێندەوە، کە لێ‌بومەوە سەرلەنوێ لە دڵی خۆما ووردم ئەکردەوە، لەمەوە کت‌وپڕ ئەوە هات بەبیرما: کە ئایا من چیم؟ ئینگلیز؟ نەء. عەرەبم؟ نەء. بەڵکو کوردم. باشە کە کوردم ئەبێ لە نەتەوەی کورد بم، کە لە نەتەوەی کورد بووم ئەمەی تێ‌گەیاندم: کە کورد ناوی لە لاپەڕەی ڕۆژگـــاردا هەیـەو ئەمیش قەومێکـە بۆ خۆی. زۆری پێ‌نـەچـوو لەو زەریـای خەیـــاڵـەدا کەوتمـە سەر ئەوە کە میللەت مادام میللەت بوو بێ‌گومان دەبێ زمان و ئەدەبیات و تاریخی بێ، ئەگەر نەیبێ بە هیچ ناژمێررێ‌و هیچ نی‌یە، لێرەدا سەرم لێ تێکچو:

تەماشای خۆم ئەکەم هیچی‌تر نیم تەنها کورد نەبێ، تەماشای بارەکەی‌تری ئەکەم سەیر ئەکەم تەنیا کورد نەبێ هەموو شتێکی‌ترم! . کسپەیەك لە دڵمەوە هات، بەوە دڵی خۆم دایەوە کە نەتەوەی قەومێکم کە لە بەرەبەیانی تاریخەوە

بەم زمانە کە من قسەی پێ ئەکەم و پێ ئەنووسم قسە ئەکەن و هیچ کۆسپێك لای نەداون لە رێگەی خۆیان بەتایبەتی کە ئەمیر شەرەف خانی بتلیسی لە «١٠٠٥»ی هجـری و «أمیـن زکی بەگ» لە ١٩٣٦ی میـلادی تاریخیـان بۆ قەومەکەم نوسیوە بست بست گەشکەم ئەکردو هیوام بە خۆم و بە قەومەکەم تازەتر ئەبوەوە. . . . »

لە کۆتایی ئەم پێشەکی یەدا نوسراوە «١٩٥١/١/٢٥ بەغدا» واتە ئەوکاتە تەمـەنی مامـۆستـا سەجـادی ٣٦ ساڵان بوەو ئەم شاکـارەی بە ئەنجـام گەیـانـدوە. . ! ئاخـۆ دەبێ چەنـدسـاڵ لەوە بەر پێـوە خەریـك بووبێ. . ؟ سەرچـاوەکـەی هەشتـا کتێب و سەدان دیـوانی شیعـرو رۆژنـامـەو گۆڤـارو کەشکۆڵ و دەست نوسە. ئایا دەبێ تەمەنی چەند ساڵان بووبێ کە ئاشقی وشەی رەسەنی کوردیو زانیاری هەمەجۆر بوە؟ دیارە لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەر لە منـداڵی یـەوە ژیـرو بلیمـەت بوە، لاوێکی کوردپـەروەری هەر لە منـداڵی یـەوە ژیـرو بلیمـەت بوە، لاوێکی کوردپـەروەری هـەست ناسـك و شەیـدای زانیـاریو زانست بوە، مەلایـەکی خاك و نەتـەوەپـەرست بوە واتـە مەلای کوردان بووە - مرۆیەکی مەزنی کەم وێنە بوە.

هەر لە چوارچێوەی ئەم خاڵەوە دەڵێم: ئەوەتا تەمەنی ٢٤ ساڵان بوە کە وەك رۆژنامەنوسێکی زمانزان و پێشکەوتن خواز گۆڤاری گەلاوێژ ی پێرەوی بۆ ماوەی ▪ سالـی خشـت بەرێـوە بردوە. . . ! یان وەك رۆژنـامـەنـووسێکی راستەقینەی میللەت پەروەر خاوەن و سەرنووسەری (نزار)ی تێکۆشەر بوە.

لە لایـەکی دیکـەوە هەمیسـان وەك مێـژوونـووسێکی نەتـەوەیی هاوچەرخ «شۆرشەکانی کورد» دەور دەکاتەوەو هەڵیاندەسەنگێنێ. لەتەك ئەمانەو چەندین کتێبی گرانبەهای تردا، خاوەنی گەورەترین سەرمایەی کەلەپووری نەتەوەیی یە کە بریتی یـە لە «کـوردواری»و زنجیـرەی شکـۆمـەنـدی «رشتـەی مرواری» کە هەڵبەتە جیهانی نرخ و ناوەرۆك و روخساری رۆشنبیریو ئەدەبیو دەروونیو کۆمەلایەتیو زمان و زمانەوانیو مێژوویی خەرمانی - رشتەی مرواری - زۆر زەحمەتە لە چلەی ماتەمیندا دەوربکرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، لەم وتارە کورتەدا دەمەوێ پەنجە بۆ چەند خاڵێکی دیکەی

گرنگیش ڕابکێشم:

یەکەم: ناوەرۆکی سەرجەمی بەرهەمەکانی مامۆستا سەجادی، واتە هەر (٢١) کتێبە بەنرخەکانی، لەگەڵ ئەو کۆمەڵە وتارو لێکۆڵینەوەو پەخشانانەی نێو گۆڤاری گەلاوێژو نزارو گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد کتێبی هەرە گەورەی جوغرافیاو نەخشەی سەرتاپای کوردستانیان لێ دروست دەبێ... چونکە ناوی سەدان گوندو ناوچەو ڕوبارو شارو هەرێم و شاخ و دۆڵ و چیای کوردستان هاتوونەتە تۆمارکردن. هەروەها عەنباری سەدان وردە زانیاری مێژوویی و کۆمەڵایەتیی ژیانی کۆمەڵی کوردەوارییە.

دووەم: ئەگەر نووسەرو هونەرمەندی شانۆییمان هەبن، ئەوا بە دەیان چیرۆکی کۆمیدی و کۆمەڵایەتی شانۆیی لە خەرمانی ڕشتەی مرواری ئامادە دەکرێ!.

سێیەم: لە سەرەوەی بەرگی یەکەمی (ڕشتەی مرواری)دا مامۆستا سەجادی دەڵێ: «ئەم کتێبە بە زمانێك نووسراوە کە زمانی کوردییە.» واتە زمانی ڕەسەنی میللەتە، زمانی کۆمەڵانی خەڵکی سادەیە، بە واتایێکی دیکە زمانی نانی ڕۆژانەو ئەفەندییە نارەسەنەکانی ناوشار نییە...!

هەر لە (حەوزەی) گەورەیی ڕشتەی مرواریدا ئەگەر ئاوڕێك لەکاتی دەرچوونی یەکەم بەرگی ڕشتە بدەینەوە دەبینین تەنانەت تا ئەمرۆکەش ئەم گەنجینە مەزنە بەقەدەر پیرۆزی خۆی تەماشا نەکراوە، بگرە لەوساکەوە تائیستاش خەڵکیوا هەن خۆیان بە ڕۆشنبیرو ئەدیب دەزانن کەچی هیچ بایەخیان بە (ڕشتەی مرواری) نەداوە!

بەڕێزان:

مرۆڤ خۆی لەخۆیدا مەزنە، بەڵکو (مەزنترین سەرمایە)یە، کارو کردەوەی بەکەڵك و چاکەخوازیی ئەو مرۆیە پاش مردنی مەزنترین سەرمایەیە. ئەوەتا بەکورتی دەڵێم: مامۆستا عەلائەدین سەجادی لەئەنجامی دڵسۆزیو گیانی کوردپەروەریو لێهاتوویی و شەونخوونی خۆیەوە سەرمایەیەکی مەزنی لە مێژووی ڕەوتی ئەدەبیو ڕۆشنبیریو کەلەپووری، سامانی نەتەوەییو

ڕۆژنامەنووسی بۆ بەجێ هێشتووین کە خۆی لەخۆیدا سامانێکی گەورەی نەتەوەیی یە بگرە سەرچاوەیەکی فرە دەوڵەمەندو تێرو تەسەلی لەبن نەهاتووی ژیانی ئەدەبی و ڕۆشنبیری ئەمڕۆکەو دوارۆژمانە. . . تا کورد مابێ نەوە دوای نەوە، نەك تەنیا شانازی پێوە دەکەن، بگرە سەرجەمی بەرهەمەکانی مامۆستا سەجادی دەکەنە کلیلێکی زێڕینی گەنجینەی ڕۆژانەی ژیانی خوێندن و خوێندەواری.

بەڕێزان:

دەڵێن : «مردوو لنگی درێژ دەبێتەوە.» ئەوەتا بەر لە ساڵ و نیوێك وتارێکم لە خولی دوەمی ژمارەی (١٢)ی نووسەری کورد لەژێر ناوی: «مامۆستا سەجادی، خەرمان بەرەکەت!» دا نووسی. داوای ئەوەم کرد تا مامۆستا سەجادی لە ژیانە میهرەجانێکی ئەدەبی گەورەی ڕێزگرتنی بۆ ساز بکرێ، بەڵام بەداخەوە، زۆریش بەداخەوە، بە تاقە دێڕێکیش پێشوازی پێشنیارەکە نەکرا. . !! ئێستاکەش وا ڕۆڕۆی بۆ دەکەین، فرمێسکی بۆ دەڕێژین.

ئەرێ تاکەی زیندووکوژی مردووپەرست بین؟!

هەرچەندە ئەم چەشنە کەڵە مرۆیانە تەنیا بە جەستە مردوون!

بام تا لە ژیانن کارو کردەوە چاکەکانیان بپەرستین، پاش مردنیشیان ڕێبازیان پەیڕەو بکەین و پەیکەری نەمری یان بۆ دروست بکەین.

لە کۆتاییدا ئومێد دەکەم، بە زووترین کات دەستنووسەکانی مامۆستا سەجادی بەچاپ بگەیێندرێن و نووسەرو ئەدیبەکانیش لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەل دەربارەی سەرجەمی بەرهەمەکانی مامۆستا سەجادی بەئاکام بگەیێنن. . تا ڕۆژێ دادێ ئامۆژگایێکی تایبەت بە ئەدەبی کوردی و بە ناوی مامۆستا سەجادی دادەمەزرێ. هەروەها پێشنیار دەکەم ئەمساڵ ژمارەیەکی گۆڤاری کۆڕی زانیاری تایبەت بێ بۆ مامۆستا سەجادی.

ئیتر هەزارو یەك چەپکە گوڵی ڕەنگینی باخچەی دیوانی شاعیرانی کورد پێشکەشی گیانی پاکی حەزرەتی سەجادی بێ.

# اسرة الاستاذ المرحوم السجادي
# تشكر السادة المؤبنين وحضور الحفل

**حضرات السادة والسيدات**

بأسم أسرة فقيدنا الغالي نعرب لكم عن بالغ تقديرنا وجزيل شكرنا لعواطفكم النبيلة وكلماتكم التأريخية المفعمة بكل معاني الحب والوفاء لفقيد الكرد والادب والتراث والدي المغفور له السيد علاء الدين السجادي الذي فارقنا على حين غرة وقد كنا بأمس الحاجة الى المزيد من أعماله الجليلة والذي كان دوماً وطيلة حياته رمز الدأب والمثابرة والجد في خدمة الشعب والقلم. فلا غرو أن نرى اليوم هذا الحشد الكريم من العلماء والأدباء والشعراء والسادة والسيدات يندفع للمشاركة في تأبينه بقلوب ملؤها الايمان والتقدير والوفاء.

أيها الأعزاء:

نحن أسرة السجادي لم نعرف عنه من سياق حياته اليومية بيننا سوى تفانيه ومثابرته وتهافته على البحث والكتابة وتقوى آلله. كان يقضي معظم ساعات نهاره في مكتبته الزاخرة ولايغادرها الالوجبة طعام أو استقبال زائر. كان منظماً في حياته اليومية. زاهداً متواضعاً في طعامه وملبسه حتى انه لم يمرض في حياته مرضاً يلزمه الفراش الى أن اختطفته يد المنون في صمت من بيننا فجأة في مكتبته وهو جالس على سجادة الصلاة يتلو آيات من القرآن الكريم.

في الختام نشكر السادة الحضور الأفاضل لتجشم عناء الحضور من بغداد والمدن الأخرى الى هذه التظاهرة الحاشدة المعبرة عن جزء مماتجيش به نفوس الجميع من الحب والوفاء والاخلاص للراحل الخالد. نبتهل الى آلله العلي القدير أن يعوض عن الفقيد شعبه كأسرته وأن يجعله ذخراً للجميع

يقتفي خطاه أبناء شعبه الغياری في احياء التراث وفي خدمة القلم والأدب.
وأن يسكنه فسيح جناته ويلهمنا واياكم الصبر على فقده. وتارة أخرى شكراً لمشاعركم النبيلة..

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

محمد دانش علاء الدين سجادي
عن أسرة الفقيد

# تأبين الاستاذ السجادي
# في مجلس المجمع العلمي العراقي
# الاستاذ الشيخ علاء الدين السجادي
# في ذمة الخلود

﴿ بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيْمِ ﴾

«كُلُّ نَفْسٍ ذائِقَةُ ٱلْمَوْتْ»

● صدق ٱلله العظيم ●

## السادة اعضاء مجلس المجمع العلمي العراقي المحترمون

تحية مباركة

وبعد، فما من موقف أصعب على المرء وطأة وأثقل في نفسه صدى مثل مقام يقتضيه الحديث عن عزيز رحل عنه وأستاذٍ طوى من بين يديه ماكان يمده علما وفقها وأدبا. أما هذا المرء فهو أنا وأما ذلك العزيز الاستاذ فهو الشيخ علاء الدين السجادي.

أجل فقد كان عزيزاً.

أجل فقد كان أستاذاً وسيظل أستاذاً

ومع هذا كله فقد رحل وقد طوى صحائفه، وفي هذا ألم لايهدهده تمثلي بقول الشاعر:

ايتها النفس اجملي جزعاً ان الذي تحذرين قد وقعا

كنت التقيه فتذكرني خطواته الوئيدة الرزنة المتزنة على درب الزمن بأنه لامحالة راحل لأنه نفس وكل نفس ذائقة الموت وكنت أجمل نفسي جزعاً وان كنت لاأستطيع أن أحذر ماسيقع.

وقد وقع إذ امتدت اليه يد الخلود في مساء يوم الثالث عشر من كانون الاول سنة ١٩٨٤ فانتقل الى الرفيق الاعلى بعد أن زرع في روضة ثقافتنا الكردية دوحةً تحمل أفنانها من الثمرات في كل فن:ـ

فهو المؤلف الاول في تاريخ الادب الكردي، وهو الجامع الاول للتراث النثري الكردي بأفصح الاساليب وأبلغها، وهو المصنف الأول في البلاغة الكردية، وهو المحقق الاول لنصوص أدبية، لقد كان رائداً والرائد لايكذب قومه فأوقد مشعلاً من الفكر الملتزم والعلم الهادف وخلق العلماء. من هنا فنحن الباحثين نقيّله آملين أن يبقى هذا المشعل متقداً أبد الآبدين.

أيها السادة ان العلماء يعرفون حق أقدار العلماء وأنا اذ ألقي بين يديكم هذه الكلمة العجلى أعبر عن معرفتكم بقدر أستاذي الشيخ علاء الدين السجادي فأراني أدعو له من آلله القدير أن يتغمده بواسع رحمته ويلهمنا الصبر على فقده انه نعم المولى ونعم المجيب.

د . كامل حسن البصير
عضو المجمع العلمي العراقي

# برقيات الى حفل تأبين
# المرحوم الاستاذ علاء الدين السجادي

السادة عائلة الفقيد الراحل الشيخ علاء الدين السجادي المحترمون

لقد كان لوقع وفاة الفقيد الراحل الشيخ علاء الدين السجادي الاثر الكبير في قلوبنا.

لقد كان المرحوم من الشخصيات الكردية البارزة التي اعطت الكثير وخدمت الوطن.. يسجله التاريخ له بمداد من التقدير والاعتزاز.

ولانشغالي وعدم تمكني من حضور اربعينية الفقيد ارجو قبول اعتذاري لعدم المشاركة سائلاً المولى العلي القدير ان يسكنه فسيح جناته ويلهمكم الصبر.. وان يقتدي به الجميع.

يحيى محمد رشيد
رئيس المجلس التنفيذي

**السادة القيمون على تأبين العلامة المرحوم علاء الدين سجادي**
**السادة الحضور في الحفل التأبيني**

وانتم تؤبنـون فقيـد الكلمـة النيّـرة وصاحب القلم الشـريف والمتفاني في سبيل اعلاء شأن ادب وثقافة شعبنا الكردي، العلامة المرحوم علاء الدين سجادي، لايسعنا الا ان نشارككم عواطفكم الجياشة تجاه فقدانه، واحزانكم المؤلمة تجاه الخسارة التي لحقت بادبنا وثقافتنا جراء رحيله المفاجيء.

اننا العاملين في مجلة (كاروان) نحيي من خلال حفلكم ذكراه العاطرة ونبجل فيه خدماته الجليلة التي قدمها طوال ماينيف على نصف قرن من سني عمره، لأدب وثقافة شعبنا الكردي.

ان علاء الدين سجادي قد رحل عنا ليدخل دنيا الخالدين الى ابد الدهر.

**أسرة**
**مجلة (كاروان)**
**اربيل ١٣/ شباط/ ١٩٨٥**

# بۆ بەڕێـــزان هەڵســـوڕێنـەرانی ئاهـە نگی چلەی ماتـــەمی خوالێخـــۆشبـــوو مامـۆستـا علاء الـدین السجادی پیشکەشە

دوای گەرمترین ڕێزو سڵاو..

لەبەرئەوەی تەندروستیم یارمەتی هاتنمی نەدا داوای لێبوردن دەکەم.

سوپاسی بێ پاپانم بۆ ئیوەی بەرێز

هەزار سڵاو بۆ گیانی پاکی مامۆستای نەمر کۆلەگەی ئەدەبی کوردی علاء الدین سجادی.

دووبارە سوپاس

دڵسۆزتان
مدحت بێخەو
هەولێر
١٣/ ٢/ ١٩٨٥

# وقائع الحفل التأبيني المقام
# في جمعية الثقافة الكردية
# في اربعينية الاستاذ علاء الدين سجادي

تخليـدا لذكـرى الاديب الكـردي الكبيـر، الاستـاذ الفقيـد علاء الـدين السجادي، وجزء من الوفاء لما قام به من خدمات ثقافية واجتماعية جليلة، وتخليـده للكثيـرين من شعـرائنـا وادبـائنـا الـراحلين. اقـامت اللجنة الثقافية المنبثقـة من المؤسسـات الثقـافيـة الكـردية، حفلا تأبينيا في اربعينية الاستاذ علاء الـدين سجـادي، مسـاء يوم ١٤/٢/١٩٨٥ في قاعـة جمعيـة الثقـافـة الكـرديـة في الـوزيـريـة، القى خلاله العديد من الكتاب والمثقفين. كلمات الرثاء والثناء. . اشادوا فيها بالعطاءات الثرة وما انفرد به الفقيد، وما تجمع في شخصه من شخصيات ثقافية عديدة، وما كان للأستاذ الفقيد من ادوار نشطة متميزة في اقامة الحفلات التأبينية للعديد من شعرائنا وكتابنا. . امثال: امين زكي وپيرەميرد وبيخود.

وافتتح الاديب المعروف مصطفى صالح كريم الحفل، واجاد من حيث الاداء وتقـديم المتحـدثين، والبيـان بين الفتـرات لاهميـة المناسبة وشخصية الفقيد بفرائد الكلم وبدائع الجمل من ان مايعزينا هو ان الاستاذ الفقيد مات بيننا ولم يكن بعيدا عنا. وان الذين يستقيمون لايموتون، وان الاستاذ الفقيد اتخذ اكثر من سبيل لخدمة شعبه وثقافة امته، حيث ان الحق واحد، وطرق الوصول اليه عديدة، وان الشمعات التي اوقدها على قمة الادب الكردي، لاتـزال موقـدة، الى غيـرهـا. . وكـانت العيون تحدق النظر الى صورة الفقيد المنصوبة على المنصة وكأنه بيننا. . يوزع بسماته ويحدثنا بلطائف عباراته

● هذا وقدم المقدم القاريء عبد الرحمن توفيق ليستهل الحفل بقراءة آيات من القرآن الكريم. . ثم طلب من الحاضرين الوقوف دقيقة واحدة اجلالا لذكرى الفقيد الغالية.

● وبدأ بعد ذلك فضيلة الشيخ محمد طه الباليساني بالقاء كلمته بالعربيّة وبين انه صاحب الفقيد، فوجده علاء في تواضعه، علاء في ادبه، وكتاباته،



دیمەنێکی دانیشتوانی کۆڕی یاد کردنەوەکە

علاء في دينه واخلاصه وخلقه (اي طابق الاسم المسمى) وانه كان معجبا بخلقه، ولاسيما قناعته، ورغم ان رحلته كانت مؤلمة، الا انه يواسينا بوجوده في ضمائرنا، وبين آثاره الادبية واوراق مؤلفاته.

● ثم القى السيد عبداللطيف عبدالمجيد گلي كلمة المؤسسات الثقافية الكردية بالعربية واوضح ان الاستاذ الفقيد يعد احد المؤسسين البارزين للمجمع العلمي الكردي، وكان عضوا بارزا فيه، وابدى جهودا مخلصة في ميدان عمله حين كان امينا عاما. . واهتم اهتماما خاصا بشؤون رجال الدين، واشاد بدوره المهم في كتابة تاريخ الادب الكردي وادارة مجلتي (گەلاویژ) و(نزار). . وبين ان على المؤسسات الثقافية ان تسعى الى طبع مالم يطبع من مؤلفاته.

● ثم بدأ الدكتور محمد شريف بالقاء كلمة عاطفية رقيقة، بالعربية جاء فيها: احييكم بمثل ماكان يحييكم به شيخنا المرحوم، واترحم عن كل ماكان يترحم، انه لا الدموع الساخنة ولا الكلمات تعبران عما نكنه له من الحزن، لم يكن اول حبيب فقدناه، الا اننا فقدنا معه ما لم نفقده مع غيره، فقدنا مدرسة كاملة في ادبه وكتابة التاريخ لبني جلدته. عرفته منذ اواسط الخمسينات، عرفته انسانا مؤمنا، يعشق التغلغل في اسرار الحياة والغازها، ويجد الراحة في نسمة الايمان، عرفته متدينا وفيا لدينه ومسلكه، وبقي مستقيما رغم تغير الاحوال والاحداث، ولم تنقطع صلته بمدرسته القديمة، كان كرديا وانتم تعرفون ماقدم لكرديته، لو كان لي حديث مع التراب الذي ضمه كنت اقول له: اكرم ضيفك، ولو كان لي حديث معه، كنت اقول له: لقد عدت الى عالم الغيب الذي كنت تشتاق اليه.

● ثم تقدم فضيلة الشيخ جلال الحنفي ليشترك في الحفل التأبيني بأزاهير من رياض شعره تحت عنوان (في رثاء علاء الدين السجادي).

● ثم بدأ الدكتور احسان فؤاد بالقاء كلمته بالكردية، وكانت قطعة ادبية رائعة نثرا وشعرا، ووصفا بديعا لتلكم الحالة التي رأى فيها جثة الفقيد الراقدة في غرفة بيته، ويوم التشييع الى مثواه الاخير في مقبرة الگيلاني في بغداد، وقيم الاستاذ الفقيد في انه لم يؤذ احدا في حياته، وكان يحب الادب لانه ادب، ويخدم الثقافة لمجرد انها ثقافة وكفى، ويخدم الناس ويرى السعادة فيها.

● ثم بدأ الاستاذ محمد جميل الروژبياني بالقاء كلمته بالكردية وفهمنا منها حبه وصداقته للاستاذ الفقيد، وكيف انه اتصل ببيته هاتفيا ليستفسر عن احواله، وهو في لحظة النفس الاخير من حياته ثم سلط بعض الاضواء، على شيء من حياة الاستاذ الفقيد، والاساليب الدراسية التي درسها، واوضح إن كردستان في القرون الماضية كانت مدرسة قائمة بذاتها، واشار الى الاخوة العربية الكردية، والروح الوطنية والديمقراطية التي تجلت في مجلة (نزار) التي كان يديرها الاستاذ الفقيد..

وكان من ديدن الفقيد ان يحل بعيدا عن الاضواء منزويا في مكتبته، وانه كان يحب الموسيقى والمقامات الكردية، وكان يترنم بها في الخفاء، ورغم ان استشهاد ابنه (دانا) كانت جسيمة ومؤلمة، وكادت ان تثنيه عن مواصلة المسيرة.. الا انه واصلها الى النهاية، فرحل وبين يديه اوراق النصوص الكردية.

● ثم حان دور الدكتور عز الدين مصطفى رسول الذي القى كلمته باللغة الكردية فأفاض وأجاد.

● ثم جاء دور المحامي والاديب جمال بابان لالقاء كلمته بالكردية، ليبين: ان الادب مرآة الشعب.. حيث انه يعبر عن مدى ذكائه وثقافته، هذا ليمهد الى الكشف عن اهمية جانب من الجوانب الادبية مما انفرد الاستاذ الفقيد بالتوسع فيه، وهو ادب النكات والفكاهة حيث اوضح المتحدث: ان الكرد كغيرهم يملكون الكثير من هذا النوع من الادب الا ان ماعرقل تسجيله هو عقدة الخجل، ورغم ان الفقيد كان رجل دين، ووجه اليه الكثير من الانتقادات، الا ان ذلك لم يمنعه من اصدار مجلداته في ذلك الادب، وكان الفقيد يقول: ان الذين نقدوني بشدة هم الذين رغبوا اكثر في قراءة كتبي تلك، وكانوا يقرأونها في الخفاء، ويتوقون الى اصدار جزء آخر من الكتاب، ثم أوضح: ان احدا لم يوسع مثله في هذا الميدان، رغم محاولات البعض قبله.

● بعده كانت كلمة الدكتور معروف خزندار التي ارسلها من الجزائر، وقرأها بالنيابة عنه اخوه السيد جمال خزندار.

● ثم بدأ بعد ذلك الاستاذ مصطفى نريمان بالقاء كلمته بالكردية لينفرد ببيان

آثـار الفقيـد الادبيـة. ويسلط الاضـواء على جميـع مؤلفـاته المطبوعة البالغة (٢١) مؤلفـا، خلال ثلاثين عامـا وفي (٥٣٦٦) صفحـة وهـذا يشكـل (٤٪) اربعـة في المـائـة من حجم الكتب المطبوعة حتي تلك الفتـرة. وأوضـح ان المؤلف الفقيد ثاني مؤلف معاصر كردي من حيث حجم الكتب المطبوعة، ولم يسبقه الا الشيخ عبد الكريم المدرس الذي فاق الفقيد الى الآن بثلاثة الاف صفحة.

● ثم قرأ المقـدم الاديب مصطفى صالـح كريم بالنيـابـة كلمـة الـدكتـور كامل البصير.. وهي الكلمة التأبينية للفقيد المرحوم الاستاذ السجادي التي سبق ان قرأها الدكتور كامل البصير في مجلس المجمع العلمي يصف فيها الدكتور باسلوبه الجميل مآثر الاستاذ الفقيد.. وبين ان العلماء يعرفون اقدار العلماء.

● ثم تحدثت الدكتورة شكرية رسول ابراهيم.. لتذكر بعضا من ذكرياتها بالكـرديـة عن الاستـاذ المـرحـوم، وقت ان كانت طالبة لديه في الجامعة.. حيث اوضحت انه الاستاذ الذي ستبقى ذكراه ابدا في الذاكرة.. وكان يشع عطفـا وحبـا بتـلاميـذه وينظـر اليهم نظرة التفاؤل والتشجيع.. وكيف انه كان يتميز بعظاته ونصائحه المفيدة، من قوله: يجب ان لا نضيع المصلحة العامة في سبيل نفع ذاتي، واننا اذا لم نهتم بانفسنا فلا احد يهتم بنا.

● ثم تقدم الشاعر عبد الرحمن المفتي ليساهم في الحفلة التأبينية ويشيد بمآثر الفقيد بأسلوبه الشعري، والقى بالمناسبة قصيدة بالكردية..

● ثم جاء دور السيد ممتاز الحيدري.. ليلقي كلمته بالكردية ويجزم بان الاستاذ الفقيد سبق الجميع.. حيث لم يصل احد عن طريق دراسته الى ماوصل اليه هو، واضاف: (٢٤) شاعرا قدم الفقيد تعريفات بهم في كتابه: (تاريخ الادب الكردي) واعتبر المتحدث مقدمات تلك التعريفات من روائع الادب، وقيم في الفقيد ذلك النتاج القيم (الكتاب المذكور) الذي الفه في سنة ١٩٥١، اي حين كان عمره (٣٦) سنة ومن هذا نفهم (كما اوضح المتحدث)..

● ان الاستاذ الفقيد كان يعشق الثقافة والادب منذ كان صغيرا، واشرف على اصـدار (گـەلاويـژ ـ نجمـة الصبـاح) وكـان عمره (٢٥) سنة، انه كان (ملا)

للاكراد حقا.

● والكلمة الختامية كانت لاسرة الفقيد القاها نجل المرحوم محمد دانش بالعربية ليقدم الشكر والتقدير الى المحتفلين وجمهور المثقفين المهتمين بالمناسبة وبين ان والده المرحوم فارقهم على حين غرة، وكانوا بامس الحاجة الى جليل اعماله، واشار الى بعض المزايا للفقيد المرحوم، من انه كان مضبوطا في حياته، وكان يلتزم مكتبته ويقضي فيها جل اوقاته، ولم يكن يفارقها الا للضرورة.

● هذا وتلا المقدم اثناء الحفل برقية الرثاء المرسلة من قبل رئيس المجلس التنفيذي لمنطقة كردستان للحكم الذاتي السيد يحيى الجاف، والبرقية المرسلة من قبل اسرة مجلة «كاروان» واعتذارا لعدم الحضور من قبل الشاعر مدحت بيخهو.

● وقررت اللجنة المقيمة للحفل طبع كلمات التأبين وما نشر في رثاء المرحوم في الصحف والمجلات، والكلمات التأبينية التي لم تقرأ في الحفل لضيق الوقت في كتاب خاص.

● هذا وكان قد توقف عن النبض قلب الفقيد المرحوم الاستاذ السجادي مساء يوم الخميس المصادف ١٣/١٢/١٩٨٤.

**العراق - ١٩٨٥/٢/٢١**

**( بتصرف )**

كتب هذا الريبورتاج بقلم السيد صالح حسن الهور يني

# مامۆستا علاء الدين سجادي

● نووسینی: شاکر فتاح ●

[مامۆستا علاء الدين سجادي] مەلایەك بوو لە مزگەوتێکی بچووکی کۆنی کووچەیەکی بەغداددا، بە مانگانەیەکی کەم، کرابوو بە پێشنوێژ.. پیاوێکی بە لەش بچووك و بە مێشك گەورە بوو مەندو زرنگ و هێمن و لەسەرخۆ بوو.. بۆ ژیانی خۆیشی تێدەکۆشاو، بۆ دلخۆش کردنی خودایش تێدەکۆشا.. بەلام هیچ دەمێك کەلك و چاکەی تایبەتی ی خۆی، نەدەخستە پێش کەلك و چاکەی گشتی یەوە... خوداناسییەکەی پالی پێوە دەنا، لە کۆری نەتەوایەتی و نیشتمانی و مرۆڤ دۆستیدا ئیسلامەتییەکەی خۆی بەکەلك بهێنێ، بۆ پێشکەوتنی کوردەواری..

● نزیکەی ١٥ سالێ خشت گۆڤاری [گەلاوێژ]و، سالێکیش گۆڤاری [نزار]ی، بە شەنگ و شۆخی و سەربەرزی یەوە، بۆ ئاراستەکردنی کوردەواری بۆ ژیانێکی چاکترو پاکترو بلندتر، بردبەرێوە.. بە دەروونێکی فراوان و رێزو خۆشەویستی یەوە ووتاری ئازادیخوازان و چاکەخوازانی بلاو دەکردەوە.

● بەرهەمێکی زۆریشی لە نووسراوانی گرنگ و گەورەو بەکەلك پێشکەشی خوێندەوارانی کورد کرد، کە بەوانە کەلکێکی زۆری بە زمان و وێژەو مێژووی کورد بەخشی..

● (مامۆستا علاء الدين) بێجگە لەوەی (بێ وەی) بوو، لە کۆری زانیاری و زرنگ کاری و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری یشدا پاژەیەکی گەورەو فراوان و زۆری بە نەتەوەی کورد پێشکەش کرد..

● کەچی لەگەل ئەم هەموو کەلك و چاکانەیدا، لە زمانی بەدگۆیانو توانج و پلاری چاوپێ هەلهێنەران، کە بە خوتوخۆرابی بووبوون بە دوژمنی، رزگاری نەبوو. ئەوانە ئەوەندە دلرەش و دلرەق بوون خەریك بوون بە هاشوهووش و چاووراوو تەلەکەبازی بەرهەمەکانی لە بەرچاوی خەلك و فەرمانرەوایان بخەن.. تەنانەت توانی یان نووسراوە هەرە بەنرخ و باشەکەی کە ناوی (مێژووی ئەدەبی کوردی)یە، بە کاربەدەستی پەروەردەو فێرکاری بخەنە

زیندانەوە، لەگەڵ ١٦ نووسراوی کەسانیتردا تا هیچ کەسێك لە نووسراوخانە گشتی‌یەکاندا چاوی پێ‌یان نەکەوێ.

● بەڵام خوداو ڕاستـــان، کارەســاتی ڕۆژگــار دەریخست، کە (مـامـۆستـا علاءالـدین)، بێتـاوان بوو، و تاوانبـاران هەر ئەو بەدگـۆو پیـاوخراپانە خۆیان بوون... هەروەهـا خودایش دەستی‌دایـە باڵی مامـۆستـا علاء الـدین، بەرزی‌کـردەوەو، چەپـۆکیشی کێشـا بەسـەر تەپڵی سەری دوژمنـەکانیدا نزمی کردنەوە.. چ نەتەوەی کوردو، چ فەرمانڕەوایی عیراق لە جاران زۆرتر ڕێزیان لێ گرت و لە جاران زۆرتر نازیان کێشاو لە جاران زۆرتریش سایەو پایەو گوزەرانی خۆشیان پێ‌بەخشی.. ئەم ئاهەنگەیش کە بۆی گیراوە بەڵگەیە بۆ ڕاستی قسەکەم.

● چەنـد خوێنـدکـارێکی زانکـۆکـەی خۆی، کە نووسـراوەکـانی مامـۆستـا (علاءالدین) یان بۆ دەفرۆشت، بە پەنجەی ناحەزەکانی، بایی (٥٢) دینار نرخی نووسراوەکانیان خوارد.. علاء الدین ئەمەندە سەربڵند بوو، شەرمی کرد لە خۆی سکاڵایان لەدەست بکات، لە بەردەم کاربەدەستانی زانکۆکەدا، یاخود لەبەردەم دادگاهدا.. چاوی لێ پۆشین!..

● لە ماوەی چەند ساڵێکدا مامۆستا علاء الدین، شەش نووسراوی منی خستە ژێرچاپەوەو سەرپەرشتی چاپ کردنەکەی کردن. لەگەڵ ئەمەیشدا کە ئەو دەسـتی کورت بوو، هەرچـەنـدێکم کرد پاداشی ئەرك و ڕەنجـەکـەی بدەمێ، لێی وەرنەگرتم!.

● لەسـەر خواسـتی خۆی، دە ساڵی خشت کە ووتـارم بو دەنـارد بۆ ئەو گۆڤارانەی دەری‌دەهێنان لە سییەکان و چلەکاندا، جارێکم نەدی بۆڵەبۆڵێك بکات یاخود ووتارێکم بەرپەچ بداتەوە.. بەپێچەوانەوە پەیتاپەیتا ووتاری‌تری

لیّ داوا دەکردم.

● هەرچەند نوسراوێکمی چاپ دەکرد، لە گوڤارکانیدا بەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستییەوە، لەسەری دەنووسی‌و پیرۆزبایی لیّ دەکردم..

● هەرچەند ڕێی‌بکەوتایە شارێك کە منی لیّ بوومایە. دەهاتە سەردانم منیش بەوپەڕی شانازییەوە دەمکرد بە میوانی خۆم. هەموو جارێك یەك دوو ڕۆژێکی بە ووت و وێژەوە لەسەر هەموو بابەتێکی ڕۆشنبیری ڕادەبوارد.

● جارێکیان لە (ئاکرێ) هاتەلام، کوڕێکی بچکۆلەی خۆشم لەبەرهەیوانی یانەکەی ئاکرێ‌دا، لە جێگایەکی زۆر خۆش و جوان و بڵندا بۆ گرت. چاو - ئەندازەجوانەکانی سوروشتی ئاکرێ، ئەمەندە بەلایەوە جوان بوون و کاریان تێکرد خۆی‌پیّ‌نەگیرا، بە دەنگێکی زۆرخۆشەوە دەستی‌کرد بە گۆرانی گوتن..

● هەر لە ئاکرێ‌دا نووسراوێکی دەستنووسی خۆی پیشاندام بیخوێنمەوەو بیروباوەڕی خۆمی لەسەر ئاشکرا بکەم. نووسراوەکە ناوی [ڕشتەی‌مرواری] بوو. منیش کە خوێندمەوە پێم گوت: «دەستت خۆش بیّ کە ئەم کۆمەڵە گەورەیەی کەلەپووری کوردەواری‌یەت بۆ کۆکردووینەتەوە و، زیندووت کردونەتەوە. بەلام ئەگەر بە قسەی من دەکەی بژارێکی بکە، تا مرواری‌یەکان لە زیزانەو بەردە ووردەو مرۆر پاك بکەیتەوە». مامۆستا دەنگی نەکرد بەلام داخەکەم بە قسەی نەکردم چونکە هەندێك لە دڵڕەشان چەواشەیان کردبوو کە بەوجۆرەی هەیە چاپی بکات چاکترە!؟.

● مامۆستای بەڕێز... کاکە علاء گیان.. تۆ مەڵیّ مردوم و خراومەتەگۆڕەوە.. تۆ زیندوویت لەناو دڵماندا.. زیندوویت لەناو لاپەڕەکانی بەرهەمە نایابەکانتدا.. تۆ هەر زیندوێتی‌ی خۆت نەپاراستووە، گەلێك ڕۆشنبیرانی وەك خۆشت زیندووکردووتەوە، وەك (باباطاهری هەمەدانی)و (ئەحمەدی خانی)و (حاجی قادری کۆیی)و (بێکەس)و (کوردی)و (نالی) و (سالم)، کە خەریك بووین خۆیان و بەرهەمەکانیان لەبیرمان بچنەوە. هەروەها مێژووی نەتەوەکەی خۆیشت تازە کردۆتەوە..

● کاکە (علاء) گیان.. خۆشی لە خۆت کە دەچیتە بەهەشتەوە.. دڵنیابە،

هەروەك لە تافی ژیـانتـدا دڵسـۆزیم بۆ نوواندوویت و، یارمـەتیم داویت و، لەسەرم کردوویتەوە، لەمەودوایش فرمانی دۆستایەتیی خۆمت بۆ بەجێدەهێنم و دریغیت لێ ناکەم..

● ئەگەر خودا کردیو منیش بەر بە هەشت کەوتم، دڵنیابە لەوەی کە لەوێ دەتدۆزمەوە و پێکەوە بەزمەکەی جاران زیندوو دەکەینەوە.

# کوردێك

● لطیف بەرزنجی ●

هەولێر - ئاوایی قەتەوی

بەبۆنەی تێپەربوونی ساڵێك بەسەر کۆچی مامۆستاو ئەدیبی بەرزو ڕۆشنبیری کورد، مامۆستا «علاءالدین سجادی».. ئەم چەند دێرە پێشکەشە..

کوردێکی نیشتمان پەروەر
داناو ئەدیبی تێکۆشەر
دڵسۆز لە ڕێگەی وولاتا
بێ‌پەروا بوو لە خەباتا...
مامۆستای ڕۆشنبیران بوو
لە خەباتا لە کاروان بوو
فێرگە بوو بۆ کوردی داماو
کوردی دەربەدەر، لێ‌قەوماو
دڵسۆز بوو لە هەموو شوێنێ
لەناو دڵاندا ئەمێنێ
لەبیرناچێ تا کورد ماوە..
ئەو ڕەنجەی ئەو لەبۆی‌داوە
ئەو نەمامەی ئەو ڕووانی
لەگەڵ هاوڕێ‌و هەڤاڵانی
جێی شانازی هەموومانە
بۆ کورد سەروەت و سامانە
بۆ ئەم گلەو لەپێناوی
لە تەمەنی پیری‌و لاوی
هەڵگری ئاڵای خەبات بوو
ڕێ‌پیشاندەری وولات بوو

به نووسین و ئامۆژگاری
رۆشنبیری‌و خوێنده‌واری
ده‌یووت بۆ کورد وامان ده‌وێ
به خوێنده‌واری سه‌رکه‌وێ
ده‌رمانی ده‌ردی خوێندنه
ریشه‌ده‌رهێنی دوژمنه
گوڵی سه‌ربه‌ستی ئه‌چێنێ
مژده‌ی ئازادی بۆ دێنێ
رۆڵه‌ی ئه‌مرۆ خوێنده‌وار بێ
زاناو چالاك و هوشیار بێ
پێنووس چه‌كی تێكۆشان بێ
ئه‌م قۆناخه بێ‌ووچان بێ
قوتابخانه هه‌ر ئاوا بێ
تا كه‌ی ئه‌م گه‌له ساوا بێ
ئه‌و سوختانه‌ی حوجره‌ی جاران
له دێهات و له‌ناو شاران
له مزگه‌وت و له هه‌یوانا. .
له‌به‌ر كووره‌و ئاگردانا. .
به‌دوای خوێندن دا ئاواره
رێبوارو برسی‌و بێچاره
له گشت ناوچه‌ی كوردستانا
بۆ نان گه‌ڕان به ماڵانا
ئه‌و «راتبه»یه‌ی ئه‌وان پێ‌ی ژیان
زۆری تریشی پێ‌گه‌یان
زاناو ناوداری كوردپه‌روه‌ر
ئازاو دلێرو جه‌نگاوه‌ر

لەگەڵ فەقێ و مەلای «وردا»
لە قوتابخانەی کۆنی کوردا
چاکی دەست پێ‌کرد ئەو پیاوە
لەبۆ ئەم کوردە جێماوە
هەتا ڕۆیی بە بێ‌کۆڵدان
ڕێبازی ئەو بوو تێکۆشان
تا بای ئەجەل و شالاوی
ئالایە دڵی پێکراوی
ماڵئاوایی خواست یەگجاری
ڕۆیی بۆ تازە هەواری
پێشکەش بە گیانی سەلاوێ
لەگەڵ نیرگزو گولاوێ
دیاری نەورۆزو بەهار بێ
پڕ لە گۆڕەکەی گولزار بێ
بنوێ زانای کوردی هەژار
بەو دڵەی خەمگین و زامار



دوا وێنەی مامۆستا علاءالدین سجادی لە ١٩٧٦دا

# ئەو بابەتانەی بە عەرەبیو کوردی
# بەبۆنەی کۆچی خوالێ خۆشبووەوە
# لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانا بلاوکراونەتەوە

# لمناسبة رحيل الاستاذ
# الشيخ علاء الدين سجادي
# الصمت البليغ

● د. إحسان فؤاد ●

رحل عنا في صمت وهدوء. وكان لرحيله المفاجيء الأثر البليغ. فالرجل كان ديدنه الهدوء والتواضع والابتعاد عن الأضواء. وكان وهو الاديب الكبير الرائد لتاريخ الأدب الكردي وأحد المسؤولين القلائل في تحرير مجلة (گەلاویژ) الغراء وصاحب العديد من المؤلفات الرصينة في النقد والقصة والتراث والأدب الكوميدي والعضو المتفرغ في المجمع العلمي العراقي (الهيئة الكردية) وكان يعتبر مساهماته الثرة شيئا لايعدو أكثر من حدود واجباته البسيطة وجزء من إلتزاماته بالفطرة والموهبة تجاه لغة شعبه وأدبه. ولهذا كان يبتعد عن الاضواء ولا يدعي لنفسه شيئا، ومقابل هذا القدر الكبير من نكران الذات لايترك مجالا الا ويستفيد منه حينما كان يكتب عن الآخرين. فمقابل كل هذا القدر من التضحيات والتواضع تجد لديه اضعافا مضاعفة من العمل الدؤوب المنهجي الصبور في مجال الكتابة عن الآخرين.

فحينما توفي العلامة (امين زكي) المؤرخ سارع فأصدر كتابا قيما في ذكراه وحينما رحل (پیرەمێرد) الشاعر الكبير جمع كلمات الرثاء والقصائد التي القيت في حفل تأبينه بالاضافة الى ترجمة حياته وطبعها في كتاب خاص. وقد طبع باكورة دواوين رائد الشعر الكردي المعاصر عبدالله گوران في جزئين. وجمع حكايات طريفة من التراث طبعها في اجزاء عديدة، مازال الجزء التاسع منها ينتظر الطبع.

والرجل كان متحمسا وكريما في جهوده. ففيما زاره قبل اسبوع من رحيله الأبدي رهط من طلبة وأساتذة القسم الكردي من جامعة بغداد. للاستفادة من آرائه والاطلاع على مكتبته الزاخرة، كان الرجل الشيخ يتحدث ببساطة وهمة الشباب وبحماس الشعراء. ويتحدث عن مخطوطاته ونتاجاته الحديثة، وعن ذكرياته ومشاريعه لخدمة التراث والأدب، فلم يكن يخطر بباله انه سوف

لن يكتب له ان يشـرف بنفسـه ـ كمـا كان يفعل دومـا ـ على طبـع مؤلفـاتـه الجديدة. اونبكي على رجل هذا ديدنه وهذه مكانته؟

ان لوعـة الفـراق وصـرامـة المـوت الفجـائي لابد ان يترك أثره العميق في قلوب أصدقاء استاذنا الراحل وتلامذته. ولكننا حينما نرجع الى انفسنا وحينما نراجع صفحات تاريخ أدبنا القديم والمعاصر وحينما نحاول الكتابة ونستلهم المصـادر العـديـدة. تبقى صورة أديبنـا الـراحـل تعيش معنـا، صورة مؤثـرة وجـذابـة، ويبقى هو مثـالا يحتـذى به وبجهـوده، ان الشيـخ علاء الـدين السجـادي كبيـر في أدبـه، عظيم في جهـوده، وممـا لاخـلاف عليه انه أحد الرواد الأفذاذ في النثر الفني وفي النقد وفي ادب التراث، وانه يدخل تاريخ أدبنا من اوسع ابوابه، فلنذكر فقيدنا الراحل بما يستحقه من احترام وحب، ولننظم لتأبينـه حفـلا كبيـرا كمـا كان يفعل للآخـرين، ولتـزدان اقـواس مثواه الأبدي بأكاليل المجد والوفاء والمحبة.

**العراق/ ١٩ كانون الاول ١٩٨٤**

# السجـــادي
# أفـل نجمــه
# لكـــن أدبـه أخلـــده

● مصطفى نريمان ●

تعرفت به قبل اثنين واربعين عاما. كنت آنذاك طالبا في دار المعلمين ببغداد وكان هو إماما لجامع صغير في الحيدرخانه، وقد دخل توا في ميدان الصحافة كمحرر في مجلة (گەلاویژ ١٩٣٩ ـ ١٩٤٩) ثم تولى الادارة فيها واضحى اكثـر العنـاصـر فعـاليـة في تحـريـرها وديمومتها، وثقت العلاقة بيننا وتوطدت عبر السنين وما كدر صفو تلك الرابطة شائبة ما الى ان وافته المنية مساء يوم الخميس ١٣/١٢/١٩٨٤ فأفـل ذلـك النجم السـاطـع في سمـاء الادب الكردي طيلة خمس وأربعين سنة.

لقد صدق الشاعر العربي واصاب كبد الحقيقة حينما قال:

حكـــم على كل الـبـــريـــة جار
ما هذه الـــدنـــيـــا بدار قرار

ليست هذه الدنيا بدار قرار لاي فرد كائنا من كان، اين الأنبياء والرسل؟ وأين العلماء والزعماء والمفكرون؟ كل فرد يؤدي دوره على مسرح الحياة ثم يرحل، فمن قدم خدمة حيوية للمجتمع سيخلده التاريخ عبر السنين.

## نظرة عامة لسيرة الاستاذ السجادي

نلاحــظ أنــه كان يتسم بالخلق القـويم والادب الـرفيـع والـوفـاء والنبـل والاستقـامـة والـرزانـه، تمسـك بالدين الحنيف منذ نعومة اظفاره فارتحل في طلب العلم قاطعا السهوب والوديان حتى حط رحاله في الثلاثينات ببغداد فاستقر فيها، كون السجادي علاقات اجتماعية مع مختلف طبقات الشعب فكـان جامعـه الصغيـر كمنتـدى ادبي كبيـر يلتقي فيـه عشـاق الادب ومعارفه والمعجبون بأدبه بين صلاتي المغرب والعشاء من كل يوم. كان هذا ديدنه قرابة الاربعين عاما من عمره يأخذ ويعطي ويسجل ما يأخذه يوميا من أفواه

المترددين عليه من أدب وتراث ونكتة وحادثة فنظم تلكم الدرر المنثورة وصانها من التلف والضياع وسماها (رشتەى مروارى ـ عقد اللؤلؤ).

للمرحوم السجادي فضل الريادة في جوانب ادبية عدة منها:

١ـ يعتبر اول من اصدر مجلة سياسية أدبية كردية ـ عربية في الاربعينات تحمل عنوان (مجلة نزار) فقد استقطبت هذه المجلة الفريدة حولها العديد من الادباء العرب والاكراد حتى اضحت متنفسا للافكار الادبية الحرة.

٢ـ تمكن من الاحتفاظ بجانب هام من ادبنا الشعبي نشرها ضمن سلسلة من الكتب طبع منها خلال (١٩٥٧ ـ ١٩٨٣) ثمانية أجزاء فاضحت تلك الأجزاء ينبوعا لتراثنا وفولكلورنا الشعبي وقد اضاف الى هذا التراث الزاخر كتابا اخر سماه (كوردوارى) جمع فيه وجوها عدة من نشاطات المجتمع الكردي.

٣ـ في النصف الثاني من عمر مجلة (گەلاويژ) كان هو المدير الفعلي لها ومحررها ومصحح موادها ومنفذ صفحاتها وكاتب حساباتها وجامع اشتراكاتها وعامل توزيعها، فرد واحد قام باعمال مجموعة كوادر، فتمكن من اصدار تلك المجلة الفريدة بصورة منتظمة وفي مستهل كل شهر، فهل من رائد آخر يتفوق عليه في هذا المضمار؟

٤ـ سجل تاريخ الادب الكردي وباسلوب متميز ومعروف لم يجاره فيه احد، عرفنا بأدباء ما كنا نعرف عنهم الا النزر اليسير، احاطنا علما بروابط ادبية بين أدب شعبنا وشعوب البلاد الاخرى، لاقى كتابه الادبي (تاريخ الادب الكردي) رواجا فاكسبه شهرة وصيتا، طبعه لاول مرة عام ١٩٥٢ وأعاد طبعه بتعليقات واضافات عام ١٩٧١ والكتاب يتحمل عدة طبعات اخرى وهو خالد كخلود صاحبه.

٥ـ يتسم مجمل النتاجات الادبية للمرحوم بالموضوعية والركون الى المصادر واتحاف المكتبة الكردية بكل ما هو جدير بالابداع والاثراء والحيوية.

لم ينج استاذنا السجادي من النقد في بعض كتاباته الادبية وكان شعاره دوما دفع الاساءة بالاحسان والترفع عن الانفعال والابتعاد عن التجريح فأحرز قصب السبق ونال الريادة في هذا النمط من الممارسة الخلقية والانسانية

فحري بنا ادباء وكتابا ان نقتدي بسيرته ونتعلم درسا من سعة صدره.

عاش السجادي سبعا وسبعين عاما زاخرة بالعطاء الفكري فقدم لبني جلدته خلال ثلاثين سنة من العمل المتواصل واحدا وعشرين كتابا بلغ حجمها (٥٣٦٦) صفحة وبذا احتل المرتبة الثانية بوفرة الانتاج وحجم الاصدارات بعد العلامة الشيخ عبد الكريم المدرس اطال آلله عمره.

تمتع السجادي بصحة جيدة فاذا ما فاجأه المرض يوما كان يعرض عن مراجعة الحكماء، برفع الاكف الى السماء وكان معتزا بولده البكر (دانا) اعتزازه بنتاجاته الادبية فلما استشهد فلذة كبده في ساحة الوغى، غدا وكأن سراج حياته قد انطفأ، وقد أتى الهم على احشائه وقضم الغم لحمه واذاب شحمه حتى صرعته نسمة برد خفيفة فأطفأت تلك الشمعة المتوقدة فاذا بنجمه المتلألىء قد غاب وتوارى هو عن الانظار لكن نتاجاته الأدبية وخدماته الواسعة ستخلده عبر الأجيال والقرون.

**العراق/ ٢٠ كانون الاول ١٩٨٤**

# لمناسبة رحيل الاستاذ الشيخ علاءالدين سجادي

# عزاء للأدب والتراث الكردي

اختطفت يد المنون قبل ايام علما بارزا من اعلام الادب الكردي ورجلا من رجال الفكر اسهم في اغناء الثقافة الكردية بمواهبه وقدراته فاعطى الحياة ما آمن بعطائه وهيأ للموروث الكردي ما جعله في متناول الدارسين بما احياه من آثاره او قدّمه لابنائه عن طريق التدريس او النشر لايمانه برسالة الثقافة ووفائه لشعبه الكردي.

لم يكن العلامة الشيخ علاء الدين سجادي الا واحدا من اولئك الذين وجدوا في رسالة العلم سبيلا من سبل السعادة وطريقا من طرق التعبير، فعاشَ مخلصا لهذه الرسالة متجردا من متاع الحياة، يستهويه الكتاب واستأثر باهتمامه البحث، فلم يبخل بعلم ولم يمنع وسيلة من وسائله الا وجد فيها برا وصدقا واحسانا.

عرفته الصحافة الكردية رئيسا فعليا لتحرير مجلة (گەلاویژ) اول مجلة كردية متقدمة في الفترة المحصورة بين ١٩٣٩ - ١٩٤٩، ووضع اول دراسة عن تاريخ الادب الكردي عام ١٩٥٢ تناول نبذة عن الكرد وكردستان وحدد فيها مراحل الادب الكردي وترجم لاربعة وعشرين شاعرا وكاتبا كرديا ترجمة وافية واشفعها بخلاصة موجزة لاكثر من مائتي مؤلف من شعراء الكرد وأدبائه.

اما مساهماته في النقد والنشر والادب والتراث الكردي فكانت اعداد كبيرة من المؤلفات ويعد مؤلفه (رشتەی مرواری - عقد اللؤلؤ) الذي صدر منه ثمانية اجزاء من الاسفار الادبية الغنية بالحكايات والطرائف المتداولة في قرى ومدن كردستان وهو كتاب رائد في هذا الباب، وما يزال الجزء التاسع منه في انتظار الطبع، وفي تبني احدى المؤسسات الثقافية الكردية في القطر لاخراج هذا الجزء الوفاء الجميل الذي يمكن ان يقدم لهذا الرجل العالم اكراما لما قدمه في حقل الثقافة الكردية، ولما ظل امينا عليه طوال حياته.

وتبقى الاعداد الكبيرة من المقالات والبحوث موزعة في الصحف والمجلات المختلفة وآخرها بحثه الموسوم (دەنگی کوردیو نیشانەی) الذي يظهر للنور

في العدد المقبل من مجلة المجمع العلمي العراقي/ الهيئة الكردية. وهذه النتاجات تشهد للفقيد بخصب العطاء ووفرة المجال العلمي الذي كان يفيض من ينبوعه.

هذا وتكريما لخدماته الثقافية اختير نائبا ثانيا لرئيس المجمع العلمي الكردي في بدء تأسيس المجمع المذكور عام ١٩٧٠.

وحبذا لو اطلق اسم الراحل الكريم على احد المعاهد الثقافية في منطقة الحكم الذاتي تخليدا لذكراه.

عرفناه نحن تلامذته بالتواضع ونكران الذات وبحبه للخير ووفائه وسماحته وكان يستطاب مجلسه لما اتصف به من دماثة خلق، ورعاية حقوق، ورجاحة عقل. فكان فقده على اهل الثقافة والعلم صعبا وعلى احبائه ومعارفه شاقا ومحزنا، ولكن الاقدار مقدرة والحياة الدنيا زائلة والبقاء لله وحده.

فرحم الله استاذنا الكبير برحمته الواسعة واسكنه فسيح جناته وعزاء للادب والتراث الكردي برحيل احد اركانه.

ومبارك للكرد بهذا الرجل العالم الذي اغنى تاريخ ادبه وتراثه.

**عبد اللطيف عبد المجيد گلى**
**العراق ٢٩ كانون الأول ١٩٨٤**

# الرجل الذكرى

● د. كامل حسن البصير ●

التقينا استاذنا المرحوم الشيخ علاء الدين السجادي قبل حين من وفاته وسألناه عن صحته فتأوه قائلا صحتي هي مغرس الأمي.

فقلت له حمدا لله على صحتك الجيدة فقال نعم الحمد لله الذي لايحمد على مكروه سواه وأصغيت اليه فخاض بصوته الرزن الحبيب في فلسفة الموت والحياة وفهمت منه: ان الانسان يوم يبلغ من العمر شاواً لايؤلمه امر سوى افتقاده من أحب أهلين وأصدقاء إذ ان ذكراهم تهيج الآلام.

وفي هذه الايام توفي الرجل واخذنا نلتمس ذكراه هذه الذكرى تفيض علينا نحن العاملين في حقل الثقافة الكردية فإذا هي شمس النهار وإذا هي نجوم الليل.

في اواخر العقد الثالث وأوائل العقد الرابع من هذا القرن كان الرجل القلب النابض لمجلة گلاويژ الأدبية والعلمية التي هي سيدة المجلات الكردية لغة وفكرا ومنهجا.

ويوم فتحت المكتبة الكردية صحراء صدرها لقلم يكتب في تاريخ الادب الكردي عز هذا القلم إلا في يد الرجل الذكرى.

وكنا نتساءل ونحن طلاب العلم عن فكر كردي يرتاد رياض البلاغة والنقد فكانت الاعذار تتوالى يأسا وحرمانا وكادت تمضي هذه الاعذار جيلا بعد جيل لولا فكر الرجل الذكرى الذي صاغ لنا في هذا الميدان العزيز كتابين في البلاغة وكتابين في النقد باللغة الكردية.

ودوحة النشر الفني الكردي قد حملت منذ دهر ودهر ثمارا من قلوب الجماهير الحكيمة وكانت هذه الثمار تنتقل شفاها حقبة إثر حقبة وتذوي طائفة منها بعد طائفة في هجير الامية واللامبالاة حتى اوشكت على الافول لولا الرجل الذكرى الذي جمعها ونسقها وبعثها نوادر وحكايات وعبرا.

وذات يوم جمعني والـرجـل الـذكـرى مجلس فتمنيت بين يديـه لو يصنف كتابا في تاريخ النثر الكردي يلتحم بكتابه في تاريخ الشعر الكردي فإذا هما جناحان لأدبنا الكردي فاستجاب لأمنيتي وشرع في تأليف الكتاب ولم ينجز منه على ما علمت ـ غير ثلثيه وبقي الثلث الاخير دمعة في عينيه الكريمتين.

وإذن فهل تهب على قلوبنا عاصفة الأسى والألم كلما افتقدنا هذا الرجل الذكرى فيما نوهنا به من رياض فكره الكردي؟!

اللهـــمَ آميـــن...

**العراق/ ٣١ كانون الاول ١٩٨٤**

# ئاوابوونی ئەستێرەیەکی گەش

ڕۆژی پێنج شەممەی ڕێکەوتی ١٣/١٢/١٩٨٤ دڵە بەجۆشەکەی مامۆستا (علاءالدین سەجادی) لە لێدان کەوت.. بەم هەواڵەش هەموو گەلی کورد بەتایبەتیش ئەدیب و ئەدەبدۆستان دڵشکاوو غەمبار بوون. هەواڵی کۆچی دوایی مامۆستای گەورەو زانای بلیمەت هەموو لایەکی سەرسام کرد چونکە تا چەند ڕۆژێک لە مەوبەر لەش ساغ و بەدەماخ بوو، کەس نەیبیستبوو کە مامۆستا نەخۆشە و نەخۆشیەکەیشی کوشندەیە و لە نەخۆشخانە یاخود لە ماڵەوە کەوتووە.. بەڵێ هەمووشتێك لای مامۆستا بەهێمنی ڕووی دەدا تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا ئەم خووەی هەر بەرنەداو پەیڕەوی کرد... بە هێمنی ژیاو بە هێمنیش سەری نایەوە. مامۆستا سەجادی ئەستێرەیەکی گەش و پرشنگداری ئاسمانی ئەدەبی کوردیمان بوو، نزیکەی چل وپێنج ساڵ بە بێ وچان و بە بێ پەروا ڕۆژی داوەتە دەم شەوو وشەی کوردی وەك ملوانکە هونیوەتەوە. هونەرێکی ئەدەبی نەماوە کە ئەسپی خۆی تێدا تاو نەدابێ چونکە کاتێ مامۆستا سەجادی لە دونیای ئەدەب و ڕۆشنبیریدا چاو دەکاتەوە. تەماشا دەکات نەتەوەکەی لە زۆر مەیداندا دواکەوتووە بەتایبەتیش لە مەیدانی ئەدەب. لە خۆی دەپرسی: من چیم؟ وەڵام: کوردم. ئەی کوا ئەدەب ومێژووی نەتەوەکەم؟ کەواتە با خۆم چاکی لێ بکەم بەلاداو ئەم کەلێنە گەورەیە پربکەمەوە. ئەوەبوو پاش شەونخونی و ماندوو بونێکی زۆر لە ساڵی ١٩٥٢ دا (مێژووی ئەدەبی کوردی) بە چاپ گەیاندو بڵاوکردەوە.

مامۆستای نەمر هەر لە سەرەتای دەرچوونی یەکەم ژمارەی گەلاوێژەوە وەك نووسەرو ئەندامێکی بەڕێوەبردنی گۆڤارەکە دڵسۆزانە بەشداری لە هەموو ژمارەکانیدا کردووە..

کە باسی شیعری کرمانجی خواروو دێتە ئاراوە سێ کوچکەی بابان: نالی و سالم و کوردی بە سەرقافڵەو بناغەدانەر دادەنرێن. سەبارەت بە پەخشان و چیرۆکی کرمانجی خوارووش مامۆستایان علاءالدین سەجادی و

شاکر فتاح، ئیبراهیم ئەحمەد بە سێ کوچکە دادەنرێن،چونکە ئاستی ئەم هونەرەیان لەلای میللەتی کورد بەرز کردەوەو بوونە خاوەن قوتابخانەو گەلێ نووسەرو چیرۆکنووس دوایان کەوت.

مامۆستای نەمر بە درێژایی تەمەنی کە نزیکەی «٧٧» ساڵ بوو، هەمیشە ڕاستگۆو بە ئەمەك و ڕەوشت بەرزو شیرین و قسە خۆش بووە، بەدوای زانستی ئایینـدا ئەم شارو ئەو شار گەڕاوە، لە سییەکانـدا لە بەغـدا دەگیرسێتەوەو هەموو شەوێ ئەدیب و ئەدەب دۆستان بۆ دیدەنی دەهاتن و تا درەنگە وەختانێ پێکەوە لە مزگەوتە بچووکەکەیدا گفتوگۆیان دەکردو شتی جوان و بەکەڵکیان لە یەکتری وەردەگرت. . مامۆستای زاناو نەمر بە ڕەوشت بەرزی خۆی پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ هەموو چینەکانی گەلدا پەیداکردبوو، ڕووداوی سەیرو چیرۆك و بەسەرهاتی فۆلکلۆری لەدەم وەردەگرتن و تۆماری دەکرد. ئەنجامی ئەم هەوڵ و تەقەلا پیرۆزەی هەشت بەرگی «ڕشتەی مرواری» بوو کە لە نێوان ساڵانی ١٩٥٧ ـ ١٩٨٣ بە چاپی گەیاندن و دیدەی خوێنەرانی ئەم هونەرەیان پێ گەشایەوە.

بێگومان «مێژووی ئەدەبی کوردی» دیارییەکی هەرە پیرۆزو گەورەی ئەو زاتەیە بۆ ڕۆڵەکانی گەلی کورد. هەتا گەلی کورد بمێنێت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نرخ و بەهای زیاد دەکات چونکە بە یەکەم سەرچاوەی مێژووی ئەدەبی دادەنرێت و لە ڕێگای ئەو هەوڵ و کۆششەی ئەوەوە ئاشنای زۆر لە شاعیرو ئەدیبە کۆنەکانی خۆمان و تەنانەت مێژووی نەتەوەکەشمان بووین.

مامۆستای زانا ساڵی ١٩٥٢ ئەو بەرهەمە نایابەی بە چاپ گەیاندو بلاوکردەوە. لەگەڵ بلاوبوونەوەیدا ناوی دانەرەکەی وەك برووسکە چەخماخەی داو شەوقی دایەوەو هەموو دەوروبەری رووناك کردەوە، تا وای لێ هات بریار درا مێژووی ئەدەبی کوردی وەکو کتێبێکی بریاردراو لە بەشی کوردی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغـدا بخوێنرێت و دانەرەکەشی وەکو «محاضر» دەرسی ئەدەبی کوردی بە قوتابیانی ئەو بەشە بلێتەوە. مێژووی ئەدەبی کوردی بە ماوەیەکی کەم لە بازاردا نەما، مامۆستا هەستی بەمە کردو بۆ جاری دووەم ساڵی ١٩٧١ بە چاپی گەیاندەوە. کە کۆڕی زانیاری

کوردیش له حەفتاکاندا دامەزرا، مامۆستایان وەك ئەندامێکی کارا بۆ ئەو کۆڕە هەڵبژاردو وەکو پێویست ڕۆڵی دڵسۆزانەی خۆی تێدا گێرا.

دەبێ لایەنی چیرۆکنووسی مامۆستای نەمر فەرامۆش نەکەین، چونکە «هەمیشە بەهار» کۆمەڵە کورتە چیرۆکێکی مامۆستایە و له چیرۆکەکانیدا بەتەواوەتی دەرەبەگ و زوڵم وزۆری دەرەبەگایەتی بەرانبەر به جووتیاران ڕیسوا دەکات. بەڵێ هەروەك دەزانن مامۆستای نەمر خزمەتێکی زۆری میللەت و ئەدەبی کوردی کردووە و دەیەها کتێبی بڵاوکردۆتەوە. له دەرگای هەموو بابەتەکانی داوەو به ئاسانی بۆی خراوەتە سەر پشت، سەبارەت به داب و نەریت و سامانی نەتەوایەتی له ساڵی ۱۹۷٤ کتێبی «کوردواری» بڵاوکردۆتەوە. دەربارەی لێکۆڵینەوەو ڕەخنەی ئەدەبیش دوو کتێبی نایابی بڵاوکردۆتەوە، که یەکەمیان به ناوی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی‌یە ساڵی ۱۹٦۸ بەچاپی گەیاندووە، دووەمیش (نرخشناسی)یە که ساڵی ۱۹۷۰ بڵاوی کردۆتەوە. دوو چامەکەی «نالی و سالم» یشی داوەتە بەر تیشکی لێکدانەوەو له دووتوێی کتێبێکی قەشەنگدا له ساڵی ۱۹۷۳ بڵاوی کردۆتەوە. سەرەرای کتێبەکانیشی هەر وەك وتمان ئەندامێکی کاریگەرو چالاکی گۆڤاری گەلاوێژ بووەو گوڤاری «نزار» یشی به زمانی کوردی‌و عەرەبی دەرکردووە. مامۆستا علاءالدین سەجادی له خولی یەکەمی ئەنجومەنی یاسادانان ئەمینداری گشتی کارگێری کاروباری ئەوقاف بووە، زۆر به چالاکیەوە کاروباری ئەو ئەمینداریەتی‌یەی بەڕێوە دەبردو ئامادەی گفتوگۆکانی ئەنجومەنی یاسادانان دەبوو، ئەو دڵە گەورەیەی مامۆستای زانا له لێدان کەوت و خەم و پەژارەی خستە دەروونی قوتابیانیەوە... لەگەڵ ئەوەشدا توانی ناوی خۆی‌و نەتەوەکەی بەرز بکاتەوەو وەك ئەستێرەیەکی گەش له ئاسمانی ئەدەبیدا بدرەوشێتەوە.. هەزار سڵاو له گیانی پاکی مامۆستای نەمر «علاءالدین سەجادی» بێت.

ئۆتۆنۆمی، ژمارە/٤ی/۱۹۸٤

# علاء الدين سەجادی

شیعری: پیربالٌ محمود

ڕەحمەت لە گیانی شادی
علاءالدين سەجادی
نەمرە، ماوە یادی
ڕابەری ڕێی ئازادی

پێی ناوێ شین و شەپۆڕ
بۆ ئاقڵمەندی پسپۆڕ
سەرنج ووردی، بەهرەزۆر
وێژەوان لە ئیجادی

نووسەرێکی زانا بوو
بلیمەت و دانا بوو
تەقەللای لا سانا بوو
لە پێناوی نەژادی

مامۆستای بەهرەداران
چنەی چریکە داران
ناوداری نێو ناوداران
کێ نایەتەوە یادی؟

کی چاکەی ئەم پیاوە
لەبیر ئەکا لەم ناوە؟
کێ لە یادی نەماوە..
(نزار)ەکەی نەوزادی؟

بانگی ئەدا لە وولات:
دە هەڵسە وا رۆژ هەلات
گیانت بکە بە خەلات
بۆ گەل بگە فریادی

(گەلاوێژ) ستارەی گەش
گۆڤارێ بوو بە بێ غەش
رای ئەماڵی شەوی ڕەش
خەم و تەم و کەسادی.

ئەیووت: خێرا، زووکە دەی
هەوڵ دە، دیلی تا کەی؟
بسێوە، بڵێ: ئۆخەی...
نەما شەوی بێدادی

بەسیەتی کوێرەوەری
نەزانی و چەکمەسەری
ئاژەڵ لە دەشت و دەری
کوو ئەگاتە گوشادی

تا ئەوەی قولە ڕەشە
خەمی بۆ ڕەنگی لەشە
خاوەنی بەخت و بەشە
تۆ نەوەی زەندو مادی

بۆچی هەروا لە خەوی
بێ گوێ و چاوو دەوی؟
کەی بێ بە خۆت بکەوی..
بڵێم: خاوەن مورادی

(مێژووی ئەدەبی کوردی)
پێی ئەڵێن زۆر پەسندی
کەرەو هەنگوێن و قەندی
بۆمان شەککەرو زادی

هەروا (ڕشتەی مرواری)
گەنجینەی کوردەواری
دیارە وەك دیاری..
لەکن گەل و نیهادی

مامۆستا ڕەوانکاریت
دەستنووس و جوانکاریت
پەخشان و ووردەکاریت
شایەتن کە ئوستادی

چاکەی لەسەر زۆرانە
تا لەئەستۆی (گۆران)ە
گەر تۆ نەبوای، مۆرانە..
ئەچووە گژ بنیادی

سڵاو لە گۆری پاکت
لە گیان و دڵی چاکت
لەشت سپاردە خاکت
ئەو (شیرین) تۆ (فەرهادی)

ئۆتۆنۆمی ژمارە ٤ی ١٩٨٤

# ئەوانەی مردن و نامرن
# عەلائەدین سوجادی

● دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوول ●

ئەم جارەش ئەبێ بڵێم کە دەستم دایــە نووسینی ئەم زنجیــرە ووتــارە بە مەبەسی ئەمەگی وەفاداریو دۆستایەتیو هاونیشتمانێتی بەجێ هێنان بەرامبەر بە ڕیزەکەسێکی جیاواز لە پلەی کۆمەلاّیەتیو ڕادەی ناوبانگ و ناسراویدا، ناوی مامۆستا عەلائەدین سوجادی لە ناو ئەو کەسانەدا نەبوو، هەر گیز بە بیریشما نەئەهات کە چەپۆکی ڕەشی مەرگ بەم زوویی‌یە لێمانی بسێنێ. زۆریشم مەبەسە کە یەکەم ووشەم دەربارەی یادی پیرۆزی هەر لێرەدا بلاّو بکەمەوە.

پێش ئەوەی فرمێسك ووشك بێتەوە.

پێش ئەوەی کفنی زەرد ببێ.

با دوو ووشەی پڕ سۆزو عاتیفە بۆ مەرگی پیرێکی هەمیشە جوان بنووسم.

بەڵێ پێش ئەوەی دەست بدەینە ئەو کتێبە گەورانەیو سەنگ و تەرازووی زانستی مەزووعی‌یـان بۆ بخـەینـە کارو لە بەرهــەمـە فراوانە هەمە ڕەنگەکانی بدوێین. با چەند ووشە لە دڵی خۆمەوەو لەسەر زمانی ئەو کەسە وەفادارانەوە کۆ بکەمەوە کە تەرمییان ناشت و ئامادەی پرسەی بوون.

وا ساڵی ١٩٨٤ ڕەوانە دەکەین، زۆری نەماوە سەدەی بیستەم ماڵئاوایی لە تۆیی خری زەوی بکا، هەر لەبەر ئەوە تەرمی پیاوە گەورەکانی خۆی ئەنێژێو کەمیان تەسلیم بە چەرخی داهاتوو ئەکات.

نزیکەی سەد ساڵ ئەبێ، چەرخی پێشوو حاجی قادری لە ئاوارەیی بە خاك سپــاردو لەوێ دایــە دەست چەرخی داهــاتــوو. ئێستــاش ئەم سەدەی بیستەمە تەرمی پیاوێکی گەورەی کوردی بە خاك سپارد.

ئەی کورد. پیاوێکی گەورەمان لە کیس چوو.

ئەی کورد. عەلائــەدین سوجــادیمــان لە بەغـدا بە خاك سپــارد. چەنـد هەنگاوێك لەولای شێخ ڕەزای تاڵەبانی‌یەوە، لە گۆڕستانە پیرۆزەکەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی خێوەتی بۆ ئاوات و ئازارو حەسرەتی ئاوارەیی حەفتا

سالـەی هەڵـدا. ڕۆژێ لەوە پێش دووا لاپـەڕەی خۆشـی بە دڵی خەڵـك بەخشینی نووسی.

زۆرشتم بۆ مەرگی مامۆستا پێیە، چونکە من یەکێك بووم لەو شایەتانەی ژیان و سەفەری درێژو پانی ئەو ژیانەی کە لە نزیکەوە ئەمناسی. ئاگاداری زۆر سووچ و کونجی ژیانی بووم. هەستم بە ئاوات و مەرامی بەرزی ئەکرد.

سوجادی کورد بوو.

کەم کەســم دیــوە ئەوەنــدە کوردی خۆش بوێو ئاواتـی بەرزی ئەو هەر بەرزیی کورد بێ.

سوجادی عاشقی ووشەی پاك و جوان بوو، زوربەی ژیانی خۆی لەگەڵ ووشـەدا، لەگـەڵ خوێنـدنـەوەدا، لەگـەڵ نووسینـدا، لەگەڵ دەنگ و ڕەشیو گەشیی چاپخانەدا بردە سەر.

کوردایـەتـییـەکی پاك، بیـرێکی پاك و سەر بە گەل و خاك و مێـژووو پێشکـەوتن. لە دڵـەوە خۆش ویستنی کەســانی چەوسـاوەو دوژمنیی هەمـوو چەشنە چەوساندنەوەیەك بوو.

نموونەم زۆرە...

لاپەڕەی گەلاوێژو نزارو هەموو کتێبە ڕەنگینەکانی شایەتن.

سوجادی زۆری نووسی، باشی نووسی، ووشەی کوردیی بە بەرگری لە کۆنەپەرستیو چەوساندنەوە بەدناو نەکرد.

دڵی گەورە بوو...

جێی ئازاری هەموومانی تێدا ئەبۆوە. خەمی بۆ هەمووان ئەخوارد، بە خۆشیو سەر کەوتنی هەمــوومــان دڵی شاد ئەبـوو. چەنـد جار دوو دڵـۆپی فرمێسکی خەم یا خۆشیم دیـوە کە بە چاویـا هاتــوونــە خوارەوە. ئەو دڵـە گەورەیەی جێی ئەو هەموو خۆشەویستییەی تێدا دەبۆوەو هەر لە منداڵییەوە ئاوارەیی بە داخی هەمیشەیی دڵی قرچاندبوو.

بەرگەی هەموو ئەو ناخۆشییانەی گرت و گەشەو خۆشی بەخشینی لە دل و

زمان و پێنووسی دوور نەخستەوە. بەڵام دەردی جگەرسووتان لەو دوو ساڵەی دواییدا بەو دڵەی وێراو خانەی سەبری سووتاندو لە لێدانی خست.

مامۆستا گیان!

تۆ لە هەمــوو کارەسـاتێکـدا دڵخـۆشیت ئەدایـنەوە. کە کەوتینـە ئەوەی لە مەرگی «دانا»ی جوانەمەرگدا ووشەکانی خۆت بدەینەوە بەگوێتا، فرمێسکت لێ شاردینەوەو بە قوڵپی گریانێکەوە کە توانای شاردنەوەیت نەمابوو، فەرمووت:

ـ خەمی من بۆ دانا، خەمی یەعقووبە بۆ یوسف.

حەزمـان ئەکـرد خاکی کەنعـانت کون بە کون بۆ بگـەڕێین و کراسـەکەی یوسفت بۆ بێنینەوە.

حەزمان ئەکرد نازو خۆشەویستیی دانات بۆ بخەینە سەر نازو خۆشەویستیی ئەوانیتر، بەڵام کەس جێی کەس ناگرێتەوەو لە ئاوارەییدا ئاوارەی یوسفێك بووی کە توانای دیتن و بۆنکردنی لاشەکەیت نەبوو. دانات بە خاك سپاردو هێندەی نەبرد ئەو دڵە گەورەیەت کە زۆری دیبو، زۆر چەپۆکی گەردوونی دیبوو، بەو کۆستەوە لە لێدان کەوت.

ڕاستە ئەڵێن سوجادی مرد؟

ئیتر لەو شارە گەورەدا ڕوو بکەینە کێ دوو ووشەی پاك، دوو ئامۆژگاریی بەنرخ، دوو چیرۆکی گاڵتە ئامێزمان بە هێمنی بۆ بگێڕێتەوە.

کوردینە دیبووتان لاوان زۆر بەکوڵ لەسەر تەرمی پیرێکی جیهان دیتوو تەمەن بەسەر بردوو بگرین.

ئەوەم لە مەرگی سوجادیدا دی.

مامـۆستـا زۆرم قسـە پێیـە. هەر کتێبـە جێی چەنـد لێکـۆڵینـەوەیە. هەر تەجروبەیە شایانی چەندین تۆمارە.

زۆر بەخشندە بووی لە ووشە بەخشینا بەو گەلەی ووشەی پاك دەردی تیمار ئەکرد، بەڵام تەوازوع ڕێی گێڕانەوەی ئەو تەجروبە بەنرخە گەورەیەی ژیانی لێ دەگرتی. ■ بنوو..

کەم بووین لە پرسەتدا. بەڵام هێڵی وەفاداریو بێوەفایی ئاشکرا بوو. لەوێدا ووتمان: زۆر جار لە پرسەدا خەڵکی لەبەر زیندووان دێن و خۆیان لە بەر چاوی ئەواندا ئەنوێنن، بەڵام ئەم دەیان کەسەی ئەو چەند ڕۆژە پێکەوە بوون هەر لەبەر نازداریی ئەو مەردە تۆراوە هاتوون.

شەرتە وەفا دروشممان بێ بەرامبەرت. تا ماوین ناوت، کردارت بە بەرز بگرین. دووا ووشەی ئەم چەند هەستی دلەم هەر ئەوەیە کە بۆ ئەو کەسەم نووسیبوو کە بە باوکی هەردوکمانت ئەزانی.

دارە ڕەشـەکـەی شەست ساڵەی مزگەوت
دڵ لە زەمـیـن و سەر لە ئاسـمـان
پاش ڕەشـەبـای جەنگە، ناسۆری زەمان
گەردەلوولی سەخت، بە زامداری کەوت
وەك شێـر ناڵانـی، سەراپـا خوێـنـیـن
وەك هەڵـۆی شەهـیـد کەوتـە سەر زەمین

★ ★ ★

بنـوو مەردانـە، وەك لە ژیـانـا
ئەسـتـێـرەیـەك بووی لە ناو چاکـانـا
کرداری جوانـت، دیـمـەنـی پاکـت
هەتـا هەتـایـە وا لە دڵـمـانـا

★ ★ ★

**هاوکاری ۱۹۸۵/۱/۳**

# الى السجادي نفحات حب ونسائم وفاء

● حسن جاف ●

حتى الأمس كنت ملء السمع والبصر. . نراك في قاعة الدرس دائم البسمة، طلق اللسان نظيفه، تخرج الكلمات المليئة بالعبر المعطرة باريج علمك الغزير الهادئة بوقارك الرزين. . لتشنف اسماع طالبي العلم ومحبي الكلمة الكردية الاصيلة وعشاق الادب. .

نلمحك تمشي الهوينا بخطى واثقة. . تقطع شارع الرشيد ببزتك الدينية ونصاعة البياض المشرق من تحت الطربوش لتحتضنك اروقة مسجدك الصغير وعيون المحبين من الطلاب والخلان المجتمعة في مجالس العلم والادب والدين. .

ترنو اليك الابصار وتصيخ نحوك الاسماع وتتفتح لك القلوب وتغتني بمعارفك العقول. .

عرفناك عالما ومعلما ورائدا. . علمتنا حب الحرف الكردي واخذت بايدينا الى مجاهل تاريخنا مبهورين مندهشين فلقد ادخلتنا الى عالم كان غريبا علينا. . جديدا لنا. .

كنت دليلنا الى درر تاريخ ادبنا ولآلىء عقود فلكلورنا. كنت بحرا من العلم والادب بلا قرار ولا شطآن

كنت كاتبا طري الحرف بديع النثر رشيق الاسلوب نقي الوجدان

عشت لشعبك فارسا مجهولا تصول في كل ميدان وستبقى في حدقات عيون شعبك حيا وشامخا على كر الدهور والأزمان.

عفوا أبا دانا ذكراك اجل من الكلمات. . ومنزلتك أسمى من كل المراتب واعظم من كل الحروف. .

ولكن عذري انني لاأملك سوى الكلمات لأوفيك غيضا من فيض دينك علينا فنم قرير العين تضيء رمسك قناديل محبتنا ويعطر ذكراك عبير وفائنا وأكاليل مودتنا

نم مطمئن الفؤاد. . فانك خالد في وجداننا ما بقي الحرف وطرزت الكلمات. .

ستبقى شجرة بلوط شامخة فوق هامات القمم
وباقة نرجس مزهرة في اروع الفصول
وروحا حية راضية مرضية في جنان الخلد ونعماء الآخرة

**العراق/ ١٤ كانون الثاني ١٩٨٥**

# هه‌ڤده ڕۆژ پێش مردن

- موحسین -

سێزده‌ی مانگی دوانزه‌ی ١٩٨٤ دڵی ئه‌دیب و موئه‌ڕیخی ئه‌ده‌بی کوردی مامۆستا عه‌لائه‌ددین سه‌جادی له لێدان که‌وت. ماوه‌یه‌ك په‌رۆشی ئه‌وه بووم ڕۆژێك له ڕۆژان به دیداری ئه‌م مه‌زنه شاد بم. ئه‌و ئاواته‌م هاته دی من و مامۆستا وریا عمرئه‌مین و کاك حسین علي محمود چووینه خزمه‌تی.

خۆزگه ئه‌و ڕۆژه دونیا برووخابایه نه‌چووبباینه، ئه‌ت ووت پێو قه‌ده‌ممان بێخێره، به‌تایبه‌تی من، پێ بۆ هه‌ر شوێنێك بهاوێم کاولی ده‌که‌م.

حه‌یف، خۆزگـه نه‌ده‌ڕۆیشت تا جارێکی تر به جۆرێکی تر ئه‌چـووینه لای.. ڕۆژ ئاوایی‌یـه‌کـان هه‌ر که له دایـك ده‌بن فرچـك به پێشکـه‌وتن ده‌خـۆن، نه‌ك هه‌ر ئه‌وه به‌ڵکـو گه‌لێـك شتی تر، تا ده‌گـه‌نـه ئه‌وه‌ی ببنه ئه‌ستێـره‌یـه‌کی پرشنگـدار له جیهـانی بیـرو هونـه‌رو ئه‌ده‌ب و بواری تر، له‌ناو شارستـانی و پێشکـه‌وتنێکی پیشـه‌سـازی و ته‌کنه‌لۆژیدا چاوان ده‌که‌نه‌وه هه‌موو ئامێرێکی به‌ره‌و پێش بردنیان له به‌رده‌ستدایه، له‌ولاشه‌وه، ئه‌م مرۆڤه کورده له سه‌رده‌مێکی ڕه‌شی چڵکنی ئه‌نگـوست له چاودا، له‌م چیـاو دۆڵ و شیـوو ته‌لانی نیـوه به به‌فر داپۆشـراوه‌دا هاتـه خوارێ، به شیعـری نالی‌و سالم و جزیری و خانی و مه‌ولاناو کۆمه‌ڵێك په‌ند و قسه‌ی نه‌سته‌ق و ئه‌فسانه‌ی میللی گۆش کرا. ڕووی له به‌غـدا کرد، مرۆڤـێکی وا بێت و دڵی بخـاتـه سه‌ر ده‌ستی، چاوی خۆی کوێر بکات گوڤار بۆ کورد ده‌ربکات. مێژووی ئه‌ده‌بی کوردی بنووسێ و بناغه‌ی ڕه‌خنه‌ی ئه‌ده‌بی کوردی دابنێ، نالی و سالم له شێوه‌ی دوو چامه‌که‌ی نێوانیان بلاوێنێته‌وه، ئه‌حمه‌دی خانی له‌سه‌ر گلێنکه‌ی چاوی دابـنێ. خاوه‌نی «من دی سه‌حـه‌ر شاهێ مه‌جـه‌ر، له بسێ دبـه‌ر، مه‌خمور بوو» و، نێوچاوی گۆران ماچ بکات. ده‌ست له ملی خه‌می ئه‌و ناوه بکـات، ئه‌ده‌ب و هونـه‌ری کوردی له سه‌رده‌مێکـه‌وه بگـوازێتـه‌وه بۆ سه‌رده‌مێکی‌تر. تۆ وه‌کو ڕێدو سارته‌رو گه‌لێکی‌تریت بۆ ئێمه، هه‌روه‌کو چۆن ئه‌وان به ناڕاستـه‌وخـۆ بۆ ئێمه‌ن، ئه‌فسووس، ئه‌فسـووس، ئه‌و ئێـواره‌یه‌ی که

چووینەلای پێش ڕۆژئاوا بوون بوو، بە پیرمانەوە هات و بەخێرهاتنی کردین و قاوەی بۆ هێناین، باسی خۆیو یادگاری خۆی بۆ کردین، قنج دانیشتبوو، پەنجە خڕو وردیلەکانی بەئاشکرا دیار بوو دەجوولان، چای تاڵی بە شەکری قەنـد دەخـواردەوەو جغـارەی کوردەواری دادەگـرت و دەیکێشـا. باسی بەرهـەمـەکـانیشی دەکـرد، ئەمـەنـدەم لە بیـرە ووتی: من چەنـد بەرهەمێکی ڕەسەنم هەیە، لە دووری بنی دونیا، دەناسرێنەوە کە هی کوردن. کتێبی کوردواری، مێژووی ئەدەبی کوردی، ڕشتەی مرواری، نرخ شناسی. ووتی ئەم کتێبانەم زۆر خۆش دەوێت، خەونی ئەم دیوو ئەو دیومن. نجا ووتی کتێبێکی ترم ئامـادەیـە لەسـەر گیـانـەوەرو ئەندامەکانیەتی ووتم مامۆستا ئەرستۆش کتێبێکی وای هەیە. ووتی بەڵی هینەکەی من بە کوردی یە. تا پاش ڕۆژ ئاوا بوون لەلای دانیشتین. چەندی هەوڵدا بمێنینەوە نانی ئێوارەی لەگەڵ بخۆین. ئای کە زۆری هەوڵدا. خۆزگە بەگوێمان بکردایە، دڵمان نەشکـانـدایـە، بەڵام، خۆ دڵمـان نەشکـاند تا بەردەرگا ئێمەی بەڕێ کرد.. ئەفسووس... کە سواری ئۆتۆمبێلەکەش بووین، هێشا هەر لە بەر دەرگا وەستابوو، وەك باوكێ کوڕی خۆی بۆ سەفەرێکی هات و نەهات بەڕێ بکات.

لە ناو ئۆتومبێلەکە هەستم بە شتێکی سەیر کرد، دەت ووت ئێمە دوو مۆرین و دەتووت هەستمان بە بێخێری پێو قەدەممان کردووە، بەڵام هەر چۆنێك بێت مامۆستا ڕۆیشت، تەرمەکەی چووە تەنیشت گوڕی شێخ ڕەزای شاعیـری دەم بەگـوڵی هاوڕێی. مامـۆسـتـا بۆ کورد، تاهـا حوسـەین بوو، سارتەر بوو، گەلێکی‌تر بوو لەوانە. ئەفسووس ئەفسووس هەزار ئەفسووس..

**هاوکاری ١٩٨٥/١/٣١**

# له چله‌ی ماموستا عه‌لائه‌دین سه‌جادی‌ی مه‌زن دا

● ممتاز حیدري ●

ئه‌و نیشتمـانـه‌ی سه‌رچاوه‌یێکی هه‌ره ده‌وله‌مـه‌نـدی که‌له‌پووری میللی‌و فولکلوره‌، ولاتی چیاو شیعرو هه‌وینی داهینانه، دایکی به وه‌فای بابه‌تاهیرو جزیری‌و بیساراني‌و ئه‌حمه‌دی خانی‌و حاجی قادری کویی‌و نالی‌و مه‌وله‌وی‌و گورانـه . ـ مه‌لبـه‌نـدی جوانی‌ی بی‌گـه‌ردی سروشتی هه‌ردم زینـدوه . . گوره‌پـانی جوره‌هـا زولم و زورداري‌و مل ملانیی چینـایـه‌تی‌و نه‌تـه‌وه‌یی‌و تواندنـه‌وه‌و داپه‌لوسینـه . . خاکی سته‌مـدیـده‌ی بی ئه‌نـدازه‌ی دیـر زه‌مانی روژگـاره . . . زه‌وی به‌پیت و به‌ره‌کـه‌تی راپـه‌رین و شورشـه، نه‌مـونـه‌ی قاره‌مانیه‌تي‌و خوراگرتن به‌رامبه‌ر هارینی عاردو ئاسنانه.

به‌لی له‌و نیشتمـانـه‌دا ـ کوردستـان ـ به‌لکـو له‌وروژه‌وه‌که زمانی زگماك له دایك بووه‌و نووسین و خویندنی کوردی سه‌ری هه‌لداوه، ریچکه‌ی شاخاوی وشـه‌ی ره‌سـه‌نی کوردی به ئاره‌قـه‌و فرمیـسك و خوین و جوانی په‌ستـه . . ریچکـه‌کـه ئه‌وه‌نـده به‌رین و دریـژ نابیتـه‌وه، که زی‌ی خه‌م و ژان ئه‌وه‌نده‌ی دیکه به‌رین و قوولتر ده‌بیته‌وه‌و هار ده‌بی سه‌ران ده‌با . . له‌گه‌ل ئه‌و هه‌موو گه‌له گورگی شه‌وه زه‌نگی ئه‌م ژیانه‌دا، ده‌یان که‌له شاعیرو ئه‌دیب و زاناو تیکوشه‌رو مروی جوامیر له‌گه‌ل بالای چیا سه‌ربلنده‌کانی سوران و موکریان و جزیره‌و بوتان به‌رزو گه‌وره بووینه‌و ده‌بن . . ئه‌و شوره سوارانه‌ی کورد جه‌رگه‌ی ره‌شـه‌بـای ئه‌غیـاریـان بریـوه‌و رووه‌و لوتکـه ده‌رون و ئه‌سپـه‌کـانیـان له قوردا سمکول ده‌که‌ن.

سوار چاکێکی ڕەسەنی ئەو کاروانە شکۆمەندە، نووسەرو ڕۆژنامەنووس و ئەدیب و زانای کوردی کۆچ کردووی نەمر مامۆستا عەلائەدین سەجادی‌یە..

مرۆڤ خۆی لە خۆیدا مەزنە، بەڵکو مەزنترین سەرمایەیە، کارو کردەوەی بەکەڵك و چاکە خوازی‌ی ئەو مرۆیە پاش مردنی مەزنترین سەرمایەیە.

ئەوەتــا مامــۆستــا عەلائــەدین سەجــادی، لە ئەنجــامی دڵســۆزی‌و کورد پەروەری‌و لێهاتوویی‌و شەونخوونی خۆیەوە، سەرمایەیەکی مەزنی لە مێژووی ڕەوتی ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری‌و کەلەپووری سامانی نەتەوەیی بۆ بەجێ‌هێشتوین، کە خۆی لە خۆیدا سامانێکی گەورەی نەتەوەیی‌یە، بەڵکو سەرچاوەیێکی فرە دەوڵەمەندو تێرو تەسەلی لەبن نەهاتووی ژیانی ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری ئەمڕۆکەو دوارۆژمانە.

تا کورد مابێ نەوە لەدوای نەوە، نەك تەنیا شانازی پێوە دەکەن، بگرە سەرجــەمی بەرهــەمــەکــانی مامۆستا سەجادی دەکەنە کێلێکی زێڕینی ڕۆژانەی ژیانی خویندن و خۆیندەواری.

ڕاستی‌یەکەی بەرهــەمــەکــانی مامــۆستا سەجادی ئەوەندە زۆرو شاکارن، بەڵکــو ڕەوســەکــەی ئەوەنــدە مەزن و گەورەیــە بە دەیــان ئەدیب و ڕۆشنبیــرو ڕۆژنامەنووس، بە دەیان ساڵیش بڕ ناکرێ...؟!!

ئەوەتا وەك ڕۆژنامەنووس و زمانزان و دەوری گۆڤاری گەلاوێژ ی پێشڕەو، یان ڕۆژنامە نووسی میللەت پەروەر و گۆڤاری نزار ـ ی خۆشەویست، یاخود تاکە سواری پسپۆری مەیدانی «مێژووی ئەدەبی کوردی» و «نرخ شناسی» و «ئــەدەبی کوردی نوێ و لێکـۆڵینــەوەی ئەدەبی کوردی» و «دەقــەکــانی ئەدبی کوردی».. یان هەمیسان وەك مێژوو نووسێکی نەتەوەیی «شۆڕشەکانی کورد» دەوردەکــاتــەوەو هەڵیــانــدەســەنگێنێ.. لە تەك ئەم شاکــارانــەدا، خاوەنی گەورەتــرین سەرمــایــەی کەلــەپــووری نەتــەوەیی‌یــە، کەبــرێتی‌یــەلــە زنجیرەی شکــۆمــەنــدی «ڕشتــەی مرواری» و «کــوردواری».. هەڵبەتە بە هیــچ جۆرێك جیهــانــی نرخ و ناوەڕۆك و ڕوخســاری ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی‌و دەروونی‌و کۆمەڵایەتی‌و زمان و زمانەوانی‌و مێژوویی‌ی خەرمانی «ڕشتەی مرواری» زۆر زەحمەتە لە چلەی ماتەمیندا دەور بکرێتەوە..؟!

لە بواری ڕەوانبێژیو چیرۆك و گەشتنامەو ڕوشنبیری گشتی دیسان سوار چاکێکی مەیدان بووە.

کۆچ کردنی مامۆستا سەجادی بە پیّی سەردەم و تاقی کردنەوەی تەمەن درێــژی ژیــانی ئەدەبیو ڕۆشنبیــری خۆیو کۆمــەڵی کوردەواری زیــانێکی گەورەی بە نەتــەوەی کورد گەیانـد. . . کە کەلێنکـەی پڕ نابێتـەوە، بگـرە قەرزێـکـی ئەوەنــدە گەورەی لە سەرمــانــە، کە بەپیّی بارو دۆخی زاتیو مەوزوعـیی کورد تا ڕۆژگــارێـکـی دووریش پێمــان ناژمێــردرێو پێمــان نادرێتــەوە. . .؟! لەم ڕووەوە بەلای کەمــەوە وەك دەڵێن: «کــەو خواردن لە بێدەستەلاتیی‌یە» پێویستە لەسە ئەو خوێندەوارو ئەدیب و نووسەرانە کە دڵسۆزو کورد پەروەرن سەرجــەمی بەرهــەمــەکــانی مامــۆستــا سەجـادی بە وردی بخوێننەوەو هەڵــوەستــەکی بکـەن. . . بزانن ئەو مرۆیـە مەزنـە، چ کارو کردەوەیەکی مەزنی بە ئەنجام گەیاندووە؟!

دەڵێن «مردو لینگی درێژ دەبێتەوە» ئەوەتا بەر ساڵ و نیوێك وتارێکم لە خولی دووەمی ژمارەی (١٢)ی گوڤاری نووسەری کورد لەژێر ناوی «مامۆستا سەجــادی خەرمــان بەرەکـەت» دا نووسی ، داوای ئەوەم کرد تا مامــۆستــای سەجادی لە ژیانە میهرەجانێکی ئەدەبی گەورەی ڕێزگرتنی بۆ سازبکرێ. . . بەڵام بەداخەوە، بە تاقە دێرێکیش پێشوازی پێشنیارەکە نەکرا.

بە هەر حاڵ پێویستە ئەو چەشنە مرۆیانە تا لە ژیان دان زیاتر ڕێزیان بگرین و شوێنی ڕەوای خۆیان لە کۆمەڵدا بۆ دەست نیشان بکەین.

لە کۆتاییدا، هیوام وایە دەست نووسەکانی مامۆستا سەجادی بە زووترین کات بە چاپ بگەیەندرێن و نووسەرو ئەدیبەکانیش لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەل دەربارەی بەرهەمەکانی مامۆستا سەجادی بە ئاکام بگەیەنن. . .

ئیتــر هەزار و یەك چەپکــەگـوڵی ڕەنگینی باخچـەی شاعیـرانی ناو کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی پێشکەشی گیانی پاکی سەجادی بێ.

## کورتەی ژیان و
## سەرجەمی بەرهەمەکانی

● سالی ١٩٠٧ لە دایك بووە. . لە مەلایەتی خوێندویەتی.
● لە هەرەتی لاویەتی هاتۆتە مەیدانی ژیانی رۆشنبیریو رۆژنامەنووسی.
● دەورێکی دیاری کراوی هەیە لە تەمەنی دەسالەی گۆڤاری گەلاوێژ ـ ی رابەر.
● خاوەن و سەرنــووســەی گۆڤــاری نزار بووە. . نزار گۆڤــارێکی سیــاسیو رۆشنبیری بووە [٢٢ ژمارەی لێ‌دەرچوە].
● جگــە لە ژمــارەیــەك کتێبی نایــابی دەرکــردووە، دەیــان وتــارو چیــرۆك و لێکۆڵینەوەی لە گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یەکان بلاوکردوتەوە.
● ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کورد بووە.
● شەش وتارو لێکۆڵینەوەی لە ژمارەکانی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بلاوکردوتەوە.
● زیاتر لە [٢٠] کتێبی بە نرخی ■■ جۆری داناوە. وەك

١ـ مێژووی ئەدەبی کوردی [دوو جار چاپ کراوە]
٢ـ ناوی کوردی
٣ـ گەشتێك لە کوردستانا
٤ـ هەمیشە بەهار
٥ـ دەستوورو فەرهەنگی کوردی
٦ـ ئەدەبی کوردی نوێو لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی.
٧ـ نرخ شناسی
٨ـ کوردواری
٩ـ دەقەکانی ئەدەبی کوردی
١٠ـ کوردو شۆڕشەکانی‌وە کوردو کۆماری عیراق

● هەشت بەرگی رشتەی مرواری دەرکردووە.
● دەڵین: کۆمەڵەکیش دەستنووسی هەیە.

● لەئیوارەی ١٩٨٤/٢/١٣ کۆچی دوایی کرد.
هەزارو یەك حەیف و مخابن مامۆستا سەجادی

**کاروان/ کانوونی دووەمی ١٩٨٥**

# بمناسبة اربعينية العلامة السجادي
# في وداع السجادي

● ابراهيم باجلان ●

لايختلف اثنــان في ان حيــاة المفكــرين المبــدعين والقــادة العظمــاء لاتخصهم وحدهم ولا تنتهي بوفاتهم. ولكن رغم معرفتنا بهذه البديهية التي لاتقبل الشك، فان حزننا يكون اعمق واسفنا مضاعفا، عندما نفقد واحداً من هؤلاء الخالـدين الـذين قلمـا يجـود الزمن بامثالهم. لاننا ندرك اهمية وجود هؤلاء بيننا، ونتمنى ان يظل هذا النموذج الفريد بيننا.

حتى وهم يعانون فانهم كالنحل يقدمون الشهد والاشياء التي ليس بمقدور البشـر العـاديين ان يقـدمـوهـا. من هنـا كانت العيـون التي ذرفت الـدمـوع محقـة. . حال انتشـار نعي الفقيـد الغـالي (عـلاء الدين السجادي) ومعذورة كذلـك. . ذلـك لان اصلب الـرجـال واقـواهم جنـانـا وثباتاً وامضاهم عزيمة تهزهم النوائب والارزاء. وان فقد السجادي خسارة فادحة رزء بها شعبنا وأدبنا المعاصر.

لذا كان وقـع نبأ رحيله على الجميـع كالصـاعقـة. . فليس هينـا يسيرا ان نفقد فجأة علمـا من اعلام الفكر الكردي المعاصر. . وان يتوقف قلب كبير عن الخفقـان طالمـا خفق في حب شعبـه. وان نفقـد بوفـاتـه عدة اشخاص تجمعـوا في شخصيتـه. . الم يكن كاتبـا موهـوبـا وقصصيـا معـروفـا منصفـا وفولكلوريا بارزا وصحفيا لامعا واديبا كبيرا، ومدرسة في الاخلاق والتواضع والابتعاد عن الحزازات الشخصية والنيل من الآخرين اجل كان اديبا وانسانا رائعا بسيطا. وهل ينكر فضله في تدوين واحياء التراث الكردي وتطوير الثقافه الكـرديـة الا الجـاحـدون؟. ان وفـاة السجـادي خسارة كبرى للفكر وللنهضة القومية، لانه افنى زهرة شبابه من اجل الادب وابناء شعبه. .

فعمـل بصمت وبـلا ضجـة من اجـل اغنـاء وتدوين تراث شعبه وتطويره، وتخليـد ذكـر الخـالـدين من مفكـريه وشعرائه ونوابغه، دون ان يبالي بالأرزاء والنوائب لذا كانت وفاته خسارة فادحة لنا. .

لقـد كان اسم السجـادي مرادفـا عنـد كل مثقف كردي. لخـدمـة الثقـافة

والادب وخدمة الشعب بكل تفان واخلاص وقدر المستطاع بلا غرور لانه كان يعتبر هذا من ابسط المهام الواجب على الادباء والمثقفين ان يضطلعوا بها وان يؤدوها عن طيب خاطر.

وقد عاش بصمت بعيدا عن الاضواء، لكنه اوقد نورا في قلب ووجدان كل مثقف كردي.

كيف لا وهو الواعظ المرشد والاديب العالم والعالم العامل الذي شمر عن سواعد الجد والعمل من اجل ارساء قواعد نهضة الكرد الثقافية في التاريخ المعاصر بكل حماس واخلاص بعد انهائه دراسته الدينية. فواصل الليل بالنهار كاتبا وباحثا ومدونا ولقد بدا رحلته المباركة وهو لايزال في ريعان شبابه لم يتجاوز منتصف العقد الثاني من عمره عندما اقتحم ميدان الصحافة الكردية، واثبت خلاله مقدرة وكفاءة عالية.

ففي عام ١٩٣٩ اصبح مديرا لادارة مجلة (گەلاويژ) واستطاع بالتعاون مع زملائه ان يوصلها الى مصاف المجلات الراقية. حتى غدت (گەلاويژ) مجلة رصينة موقرة في تاريخ الصحافة الكردية، فكانت صحيفة من صحافة الرأي غايتها وهدفها خدمة الشعب وازدهار ثقافته، وخدمة الحقيقة دون اي خوف او تردد، وظلت هكذا طوال عشرة اعوام وهي سنوات عمرها المباركة. وهي التي ظلت امينة لرسالة الصحافة الحقيقية، وكانت منبرا للفكر الحر، وصحيفة ملتزمة لم تنحرف قط عن نهجها القويم.

كما اصدر مجلة (نزار) في عام ١٩٤٨ وعقب انتفاضة كانون الخالدة فكانت مكسبا من مكاسبها ولسانا من السنة الجماهير المنتفضة والمتوثبة من اجل الحرية والعزة الوطنية والديمقراطية، وظلت تصدر باللغتين العربية والكردية، حتى خنقتها الوزارة السعيدية بعد الوثبة، لكنها ظلت نجمة لامعة في تاريخ الصحافة العراقية عموما واول مجلة سياسية كردية. وكل ذلك بفضل السجادي الذي آمن بان «ليس ادعى الى الخدمة العامة والاصلاح الحقيقي من ان تقوم الصحافة الوطنية الحرة بواجبها المقدس في عرض هموم وآمال المواطنين على المسؤولين لتفادي هذه المشاكل والقضاء على كل عوامل الشكوى والتذمر ورفع مستوى المواطن العراقي في احواله الاجتماعية والمادية والمعنوية.

كمـــا كتب ايضـــا: ان ما يشعـر به الاكـراد هو عين ما يشعـر به اخـوانهم العرب، وان ما يجمعهم من امل والم هو الاكسير الذي تنبثق عنه الوحدة العـراقيـة التي نريـدهـا ان تكـون دائمـا وابـدا فوق الجميـع». هكـذا فهم السجادي رسالة الصحافة وهكذا قدم العدد الاول من مجلة «نزار» وهذا ما آمن به طوال حياته.. خدمة الشعب اولا واخيرا وتفهم كل من العرب والكرد لامال واماني شقيقه. وعدم فسح المجال للاستعمار والرجعية ان يتصيدا في الماء العكر. ولم يكن هذا شعاره في مجال الصحافة وحدها بل كان هكذا يعمل بجد واخلاص في كل المجالات والميادين التي عمل خلالها سواء في مجـال التـدريس والمحـاضـرة حيث عمـل مدرسا ومحاضرا في كلية الاداب الفرع الكردي منذ عام ١٩٦٠ او في المجمع العلمي الكردي عندما اختير عضوا فيه عام ١٩٧٢. كما ترك ذكرا طيبا حين تولى الامانة العامة للشؤون الدينية في منطقة كردستان للحكم الذاتي بعد صدور قانون الحكم الذاتي.

بالامس وضعت مؤلفـاتـه المـوجـودة عندي وهي ليست كل مؤلفاته. وضعتها امامي. وانا اتأملها بالم وحسرة ممزوجتين بالاعجاب والاكبار، اعجاب بانسان استطاع ان يقدم كل هذه المؤلفات لشعبه خلال ثلاثين عاما، واسف على فقد اديب له هذه النتاجات التي لا تستغنى عنها المكتبة الكردية، لان كل واحـد منهـا تحفـة قيمـة في مجـاله، وتجلت همة الفقيد امامي وتجسمت، عندما تأملت صفحاتها وقلت في نفسي ومع نفسي كم قضى هذا الرجل من وقت في تأليفها وكم استغرق تدوينها، فلو طلبت الى احدهم ان يكتبها فقط وكما يكتب التلميذ الواجب البيتي» اجل مجرد كتابة هذه المؤلفات تحتاج الى اعوام فكيف به وهو يفكر ويناقش ويستنتج ويدون في نفس الوقت، فلو لم يكن للسجادي غير كتابه تاريخ الادب الكردي لكفاه فخرا، ولو لم يخلف غير (نزار) و (گەلاويژ) لكانتا خير شاهدتين ناطقتين بفضله وجهوده واخلاصه وتفانيه، اذا كيف لا يكون الالم عميقا لفقده والحزن مضاعفا وهو احد رواد الصحـافـة الكـرديـة ومؤرخ الثورات الكردية منذ حوالي قرن من الزمن وحتى عام ١٩٥٨.. ثم من ينكـر سلسلة (رشتەی مرواری- عقـد اللؤلؤ) باجـزائها الثمانية، ذلك العقد الفريد في تاريخ التراث الشعبي الكردي.. اضافة الى كتاب رحلاته في كردستان والمختارات وذكرى المؤرخ والاديب الكردي البارز

محمد امين زكي الذي خلد ذكره به وقاموسه وكتبه في البلاغة والنقد والادب ومقالاته السياسية.. هذه القائمة الطويلة المضيئة في سماء المجد والفخار وهي خير سلوى لنا بفقده.

اجل ايها الشيخ الجليل والاستاذ الفاضل ماذا نذكر من مناقبك؟ مجلسك في مسجدك الذي كان مضيف الادباء والمثقفين وكل الكرد، ذلك المجلس الذي كان من ثماره (رشتەی مرواری)، ام خدماتك الجليلة لشعبك ووطنك. لقد فقدناك ونحن بأمس الحاجة الى علمك وخبرتك وفضلك وادبك وخلقك الرفيع، ووداعتك وطيبتك، وطبعك النافر من الاساءة للآخرين. نحن نعلم ايها الاستاذ الغالي ان الموت سنة الحياة.. ولكننا لانعتبر امثالك امواتا.. ولن يكون بمقدور الموت ان ينال من ذكرك واسمك.. فانت تعيش في قلوبنا وضمائرنا وستظل النجم اللامع في سماء الادب والفكر الكردي تبعث بضياءك الى الاجيال المتعاقبة.

لذا نقول لك وداعا ايها الراحل العزيز.. وحسبنا هذه الثروة التي تركتها لنا، وهي ثروة لاتقدر بمال وذهب، وهي سلوتنا - وانيسة وحدتنا، وسميرة مجالسنا لأعوام واعوام - كما كانت في حياتك بل واكثر، لانها تزداد قيمة على مر الاعوام، فنم قرير العين ايها الشيخ الرشيد والاديب والاريب والانسان المتواضع الكبير في تواضعك الصامت الصاخب، وداعا في عالم الفناء ومرحبا في عالم الخلود والبقاء. رحمك آلله واكرم مثواك كما اكرمت نفسك وشعبك..

**العراق/ ١٩٨٥/٢/١٦**

# به بۆنــەی کۆچی دوایی مامــۆستا عەلائـەددین سەججادی یەوە

مەرگ و ژین میسلی سێبەرو تاوە
ئەوی باقی بمێنێ هەر ناوە

حاجي قادری کۆیی

● د. حەسەن جاف ●

زانـاو نووسـەری فەرەنسەیی ڤۆلتێر لە وتـەیـەکیـا ئەڵێ: «تـاقە وشەیەکی ناسـك و خۆش و بەسـوود بە زینـدوویی ببیسم، لە لاپـەرەیـەك ستـایش و پیاهەڵدانی دوای مردنم گەلێك لام چاکترە».

وەنـەبێ ڤۆلتێـر موحتـاجی پیـاهـەڵـدان بووبێ لە ژیـانیا. ناوبراو چ پێش مردنـی و چ پاش کۆچی دوایی کردنیشی، میللەتـە کەی خۆی بەتـایبـەتی و هەموو میللەتانی تری شیفتەی ئازادیو زانست و راستی بەتێکرایی نرخێکی تایبـەتی یـان بۆ دانـاوەو بایـەخێکی شایـانیان بە بەرهەمە زانستی یەکانی داوە. مەبەستی ڤۆلتێر ئەوەیە پەندێکی بەسوود بە میللەتان رابگەیەنێ کە ئەویش ئەوەیە قەدری رۆشنبیران و زانایان، تا لەژیاندان بگرن و، بە چاوی رێزەوە سەیریان بکەن و، دوایمەخەن بۆ پاش مردنیان کە خۆیان هیچ کەلکیکی لێ وەرناگرن.

بەراستی جێی داخە رۆشنبیران و زانایانی دنیای سیهەم تا لە ژیاندان، نرخێکی وایـان بۆ دانـانرێ هاوسـەری خەبـات و تێکـۆشانیان بێت لەپێناوی هۆشیـارکـردنـەوەی هاوولاتـەکـانیـانـدا، بەڵکـو زۆر جار هەر هیچ نرخیان بۆ دانانرێ، چونکە هاوولاتە کانیان ئەوەندە پاشکەوتوون، قەدری ئەو ئامانجە پیرۆزانە نافامن کە زاناو تێگەیشتووەکانیان بۆیان تێ دەکۆشن، بەلکو زۆر جار لەوە زیاتریش، لەسەر ئەو خەبات و تێکۆشانەیان ئازاریان داون و بەگژیانا چوون.

مەبەستی منیش لەوم وتارەمدا ئەوەیە باسی ڕۆشنبیریکی پایەیەرزو زانایەکی گەورەی گەلەکەمان بکەم کە خوالیٚخۆشبوو مامۆستا عەلائەدیین سەججادی‌یەو، ئەو ڕاستی‌یە بخەمە بەرچاو کە ناوبراو تا لە ژیانا بوو ئەو نرخەی نەدرایە کە شایانی ڕۆشنبیریٚکی دلسۆزی خاوەن بەهرەی وەك ئەوە. ئەگەر تەرازووی خزمەتگوزاری‌و ولاتپەروەری لەنگ نەبوویٚ، ئەبیٚ هەموو کوردیٚك یادی پڕ لە شانازیی ئەو زانا پایەبڵندە لە دل و دەروونیا ڕابگریٚ.

عەلائەدین سەججادی، بەرهەمە زانستی‌و ئەدەبی‌یەکانی خۆی بەونیازە نەنووسیوە پیٚیان بژی، بەلکو بۆئەوەی نووسیون گەنجینەیەکی بەنرخ لە ڕیٚگایانەوە بە نەتەوەکەی پیٚشکەش بکات. عەلائەددین سەججادی نیشتمان پەروەریٚکی ڕاستەقینە بوو. باش لەوە گەیشتبوو کە نیشتمانپەروەری بە وتەی ڕووت نی‌یەو، ئەبیٚ هەوڵی بۆ بدریٚ و بەرهەمی بۆ بهیٚنریٚتە کایە. لەم بارەشەوە بەدریٚژایی تەمەنی هەوڵی داو هیچ دریٚغی نەکرد. ئەو لەمیٚژ بوو تیٚگەیشتبوو کە تەمەنی ئادەمیزاد لە جیهانا لەچاو تەمەنی گەلیٚ گیانداری‌ترا زۆر کورت و دەمە. لەبەر ڕووناکیی ئەم ڕاستی‌یەدا تەقەلایەکی بیٚوچانی لەپیٚناوی خزمەت بە ئەدەب و زانستی میللەتەکەیدا دا، تا بتوانیٚ لەوڕیگایەوە تەمەنی خۆی دریٚژ بکات و، بەڕاستی‌یش تەمەن دریٚژ بوو و هەرگیز بەمردوو دانانریٚ. جیٚگەی بەرزی ئەو زانا یەمان لە گشت ژیانی ڕووناکبیریماندا دیارە. عەلائەدین سەججادی ئەستیٚرەیەکی گەش بوو لە ئاسمانی ئەدەب و زانستماندا و لە گەلیٚ ڕووەوە شایانی ئەوەیە بە دوورو دریژی لیٚی بدوییٚن، وتاریك و چەند وتار مەیدانی لەوە تەنگترە بەشی ئەو ئەرکە بکا. بۆیە ئیٚمە لیٚرەدا تەنها لە چەند بەرهەمیٚکی ئەدوییٚن.

سەرپەرشتی کردنی عەلائەددین سەججادی لە گۆڤاری (گەلاویٚژ)و نووسینەکانی لەو گۆڤارە بەنرخەدا، بە شایانترین خزمەت بە ئەدەب و زانستی کورد ئەدریٚتەقەلەم، ئەمە باشترین بەلگەیە بۆ خەبات و تەقەلای ئەو زاتە لەڕیگای گەشەپیدانی ئەدەب و زانستی کوردیدا.

کتیبی بەنرخی «میٚژووی ئەدەبی کوردی» پایەیەکی تایبەتی و دیاریی لە دنیای ئەدەبی کوردیدا هەیە. ئیٚمە گوی نادەینە بیروباوەڕی هەندیٚ لە

ڕۆشنبیرانمان لەبارەی ئەم کتێبەوە کە تیرو توانجیان لێ گرتووە گوایە ئەبوو وابوایەو وانەبوایەو. تاد، چونکە ئەم جۆرە تیرو توانجانە هیچ کاتێ و بە هیچ ڕەنگێ ئەم ڕاستی یە ڕوونە ناگۆڕێ کە ناوبراو لە بەرهەمی مێژووی ئەدەبی کورددا سەرکەوتوو بووە. ئەو خۆی لە سەرەتای ئەو مێژووەدا دەڵێ من دان بەوەدا ئەنێم کە دانانی مێژوویەکی ئەدەب لە هەر زمانێکا بێ ئیشی تاقە کەسێك نی یە، بەڵکو پێویستی بە لیژنەیەکی دانای زانایە تا بتوانن ئەو ئەرکە بەڕێوەبەرن. بەڵام ئەوەی ڕاستە ئەوەیە مامۆستا عەلائەددین ئەرکی لیژنەی داناو زانای بە ڕێکوپێکی گرتەئەستۆو بە باوەڕێکی پتەوو بە هێزێکی لە پۆڵا قایمترەوە، ئەم بەرهەمە بەنرخەی بە تاقی تەنیا هێنایە بەرهەم و پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کرد، بەرهەمێکي وا کە بەدرێژایی ڕۆژگار بەنرخەو بەهای کەم ناکا.

مامۆستا عەلائەددین سەججادی وەنەبێ هەر لە ئەدەب و مێژووی ئەدەبی کوردی کۆڵیبێتەوە، بەڵکو لە بەرهەمەکانی تریشیا وەك (شۆڕشەکانی کوردو، کوردو کۆماری عێراق) و (گەشتێ لە کوردستانا) گەلێ زانیاریی بەنرخ و بەجێمان دەربارەی پێشەواکانی کوردو دەوریان لە مێژووی کۆن و نوێماندا، ئەدا بەدەستەوە. ئەم دوو کتێبە هەروا پڕو سەرشارن لە زانیاریی بەسوود لەبارەی ژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتیی میللەتەکەمانەوە.

یەکێکی تر لە بەرهەمە بایەخدارەکانی مامۆستا عەلائەددین کە قورسایی یەکی تایبەتیی خۆی هەیە لە ترازووی ئەدەبی کوردیدا، (ڕشتەی مرواری) یە کە تائیستا هەشت بەرگی لێ لەچاپ دراوە. ڕشتەی مرواری بەرهەمێکی بایەخدارە پڕە لە بیروباوەڕی کوردانەو قسەی خۆش و نەستەقی پێشینان. شایانی وتنە ئەم ئەدەبە فۆلکلۆری یە کە بە زمانێکی سادەو بێ ڕازاندنەوە وتراوەو، هەر واش نووسراوەتەوەو بە ئەدەبی «گشتی» ناوئەبریو، شان بەشانی ئەدەبی نووسراوو هۆنراوە ئەوەستێ، جەوهەری ئەدەبی ڕاستەقینەی زمان دەرئەخا. لەڕاستیدا هەشت بەرگەکەی (ڕشتەی مرواری) ئاوێنەیەکی باڵانمای ژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئایینی میللەتەکەمانە.

به کۆچی دوایی خوالێخـۆش بوو مامـۆسـتـا عەلائـەددین سەججـادي کەلێنێکی گەورەو فراوان کەوتە کۆشکی ئەدەبی کوردی، میللەتەکەمان زاناو تێکۆشەرێکی دڵسۆزی ڕاستەقینەی خۆی لەکیس چوو.

مامۆستا عەلائەددین بەجێی هێشتین، بەڵام ناوی زیندووەو نامرێو تا دنیا دنیـایـە هەر پایـەدارە، چونکـە میـراتێکی گرانبـەهای لەپاش خۆی بۆ گەل و وڵاتەکەی بەجێ هێشت کە هەتا هەتایە لە مێژووی نەتەوەکەمانا ئەدرەوشێتەوە.

لە پەروەردگاری توانا ئەپاڕێمەوە لە مامۆستای کۆچ کردوومان خۆش بیو شوێنی کوێر نەکاتەوەو بیکا بە سەرمەشقی ژیان بۆ هەموو ڕۆشنبیرانی کورد.

العراق ٢٠/٢/١٩٨٥

# له چلەی کۆچکردنی مامۆستا عەلائەدینی نەمردا

● کەمال غەمبار ●

تۆ نەمردووی، کێ دەڵێ تۆ مردووی
تۆ مردووی زیندووی، نەك زیندووی مردووی

دەڵێـن نرخـی ژیــان لە مردنــەوە وەرئــەگیــرێ. وا ڕۆژی بەهــەزاران لەدایك دەبن و بەهەزارانیش دەمرن، هیچ شتێکیش وەك مردن ڕووی مرۆڤ ناشارێتەوە، هیچ شتێکیش وەك مردن بەسام و ترسناك نی‌یە، بەتایبەتی کە چنگی لە مرۆڤێکی ئازیزو داناو زانا گیردەکات و بەیەکجاری ونی‌دەکات. . وا مامۆستا عەلائەددینیش لەگەڵ کاروانی نەمران کەوتەڕێو ئەویش ماڵئاوایی دوایی لێکردین و خەونێکی هەتا هەتایی لێکەوت.

بەڵام زاتێکی ئاوا کە تا لە ژیاندا بوو ئەستێرەیەکی پرشنگداری شەوی تاریکی کوردەواری بوو، دەبێ پاش کۆچکردنی چ پایەو شوێنێکی تایبەتی لە دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورددا هەبێ؟

ئەگــەر مامـۆستـایـەك بە دەیـان کەسی پێگـەیـاندبێ، ئەوە مامۆستای نەمر بەهەزاران هەزارانی پێگەیاندووەو، چەند نەوەیەك قەرزاری چاکەو پیاوەتی‌و دەستی ڕەنگینی ئەون کە لە ڕێگەی گۆڤاری گەلاوێژەوە دونیایەکی‌بەرفراوانی بۆ ئێمــە کردەوە. لە ڕێگــەی ئەو گۆڤـارە بەنـرخـەوە زۆر شت فێـربـووین و زمـانـەکـەمـان پوختتـرو پاراوتـرو بوو و ئاسـۆی بیـرکـردنـەوەمان فراوانتر بوو. بەرهەمەکانی مایەی خۆشبەختی و شانازی‌و دڵشادین.

بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەدەبی گەلەکەماندا گەنجینەیەکی ئاوا بەنرخ و گرنگمــان دەکــەوێتــە دەست کە ئەویش (مێــژ ووی‌ئـەدەبی کوردی)یـە کە هێشتـاش و ڕۆژ بەدوای ڕۆژ وەك سەرچـاوەیـەکی بەرزو دیـار زیـاتـر بایەخی دەبێت و هەرکەسێ دانەیەکی لەو گەوهەرە بەنرخە هەبێ خۆی بە بەختەوەر دەزانێ کە مامۆستای نەمر ڕەنجی بێ‌پایانی لەپێناودا بەخت کردو ئەو سامانە ئەدەبی‌یەی بە ئێمە گەیاندو توانی بیپارێزێ و لە کتێبخانەی کوردیدا شوێنی

دیاری بۆ بکاتەوە. سەرەڕای ئەو بەرهەمە قەڵەمە ڕەنگینەکەی هەر لەکارابوو و زۆر نوکتــەو قســەی بەتــوێکــڵ و چیرۆکی خۆش خۆش و بابـەتی ئەدەبیو ڕۆشنبیریو زمانەوانیو هەمەجۆرەی بۆ پاراستین و پێشکەشی کردین.

ڕاستە هەمووکەس دەبێ بەدیداری مەرگ بگات، بەڵام هەموو کەسێك هەر نەمر نی یە. نەمر ئەوکەسەیە کە شوێنی دیارەو ناوی کردارەکانی ویردی سەر زمانی هەموانن و هەردەژین.. حاجی قادری کۆیی ڕاستی فەرمووە کە دەڵێ:

مەرگ و ژین میسلی سێبەرو تاوە
ئەوی باقی بمێنێ هەر ناوە

مامۆستا عەلائەدیین بە بەرهەمە ڕەنگینەکانی بە شاکارە ناودارەکانی، بە کردەوەکـانی، لە گەورەتـرین و والاتـرین دەرگـای مێـژووەوە پێدەنێتـە دونیای نەمری هەرچەندە کە بە لەش لە پارچە زەوییەکی بچووکدا ئۆقرەی گرتووە، بەڵام گیانە پاکەکەی هەمیشە لە ئاسمانی کوردەواریدا بەرەو بەرزی دەکشێو لەگەڵمانایەو نووسینەکانی مامۆستای نەمر ژیانێکیتری پێدەبەخشن کە ئەو لە ئێمە جیانەبۆتەوەو ئێمەش لێی جیانابینەوەو، لەگەڵ هەر وشەیەك لە وشەکانی ئەومـــان لە بەرچـاو دەبێ، خۆمـان بە ئەمـەکـداری ئەو دەزانین و هەرگیـز لە چاکەو پیاوەتیی دەرناچین.

ئیتـر ئاســوودە بنــوو ئەی مامـۆستـای نەمـر! تۆ مردووی زینـدووی نەك زیندووی مردوو!

العراق ٢٣/١/١٩٨٥

# تحاور الخواطر
# في غمرات موت السجادي

● مسعود محمد ●

ما هذه الدنيا بدار قرار، فأثبت ثوابتها زائلة وارسخ رواسخها باطلة، ننزلها مضغا عاطلة ناصلة: اول صلاتها بالوجود صراخ اعجم لايبين ولا يستبين، وقصارى دوامها في النبض اذا طال فوق المأمول دقة ساعة يتراوح رقاصها بين الازل والابد، واحلى خواتيمها نكوص هين الى العدم المدفون في الثرى حيث تخلقت اول مرة. وتضطرب المضغ بين العدمين تقرض حواف عمرها موغلة فيه الى عتبات الوداع حتى (اذا بلغت التراقي وقيل من راق) تلفتت نحو الخراب المهجور وراءها فيما طغت وبغت فودت لو ارتدت وكرت بها الحياة بغير ما مرت، فلا تنال مناها وتساق الى منتهاها اشباحا في طوايا الغيب المرهوب: فوا حسرتا على خسران ليس عنه عوض وانتهاء لا مستأنف فيه وانطواء في الهاوية بنواصي كاذبة خاطية. فيا ليت انها قدمت لحياتها بنور يضيء في مماتها وعطر يضوع بعد فواتها بوفاتها، ويا ليت يقين الارتحال عند الحشرجة وافاها إبان القدرة في المهلك والمرفق والاختيار بين المعصية والمصلحة اذا لثقلت خطاها الى الشر واوسعت في فسح الخير فاستنارت الحياة بغير ظلامها واطمأنت النفوس الى غير الوجل وامتلأت الذمم بغير الحرام وعمرت الهمم لغير الخراب، فيا هول الحسرة على امتناع الخير الممكن واستعصاء النعيم المحتمل وابتعاد السلام المنشود في كل روح. ويا خيبة الخيبات في ممكنات مرجوة تعذرت، ولها تحت السمع والبصر شواهد من الاحياء والاموات شع منها النور وفاض الامان وتدفق الاحسان وثقلت بها موازين الصلاح في معادلة النقيضين: فأين جنكيزها من عمر بن عزيزها وما مقام ابن حنبل في سجنه وجلد نعليه اكرم من ناصية ساجنه وكيف التوافق بين منابر العناتر الصارخة بالويل والثبور وبين محراب السجادي المنفتح على البشرى والنور!! أم يقال انها سنة الكون وضرورة التكامل واقتضاء النقائض في اجتماع الاضداد؟ بَعُدت اولئك من تخاريج تبرر للشر وتديم للغطرسة وتكمل الحلقة المفرغة في تقبل المكروه، فما من خلجة في احاسيسنا

تنبض بتصديق حتمية المذلة ولزوم الضراوة الا استعبدت قسطا من ارادتنا لفجور اللاهي وعتو الطاغي واساغت في منطقنا جوع العاري وهوان الكظيم وتشرد اليتيم وتطاير الاشلاء، فنحن مجندون ضد الحق والخير والجمال على قدر تسليمنا لتأصل الشر في النواميس وكمون الظلم في الطبائع وامتزاج القبح بالصور. ويتطور فينا شعور التسليم بالواقع الكريه كحقيقة قائمة خارج وجودنا الى الاستسلام لمقتضاه في لب واعيتنا ثم نقفز قفزتنا الى استمراء الجانب الشهي في الوقوف عند حكم الضرورات الملجئة الى الفساد فنتجنكز ونتهتلر وقد نتقزم ذيولا وفلولا في بطانة اصحاب الولائم الفخمة نلحس الحثالة ونحسو الثمالة لابورك فيها عقبى ولا شَرُفت نهاية في اسفل السافلين.

انها اعجوبة الاعاجيب في البشر المتنور المثور المتمنطق المتفلسف ان يزعم احاطة علمه بالحقائق الطبيعية والتاريخية يستخرج من عمومها قواعد شاملة كاملة في المصائر الموكولة الى حكم المادة واستلزام المصالح واستدعاء الاحوال واقتضاء الدواعي ويستكنه مسارها المحتوم في المجتمع بدينه ودنياه حاضرا ومستقبلا فيرسم لها خرائطها ويفرغ قوالبها ويملس سطوحها وجوانبها بمالح من منطق الحكمة وينتظر من بركاتها ان تتوالى على الناس بالشبع والامان والصلاح وطولة العمر حتى اذا انتهى من تأسيس هذه الاركان واقامة ذلك البنيان فلم يغادر فيه صغيرة ولا كبيرة الا احصاها، تغافل كالمعتوه عن حركة الشهوة في عروقه ونزوع السطوة في طموحه وقبضة النهم على اختياره وقيادة الاستعلاء لخطاه واقتران الغلطة بسلوكه فما تحرك لمقاومتها وتخفيف عنفوانها وتلطيف بركانها وثورانها في نفسه وفي اتصاله بالدنيا من حوله: لقد تغنى بانه الجم الوجود وشكم التاريخ ووجه التطور بمعادلاته العلمانية وموازناته المنطقانية ثم نسي نفسه فما عدل فيها او بدل واطلق خصوصية طبعه في الاحتكار والنزوة والغلبة من كوابح الردع والهداية واناط النقاهة والنقاوة والصلاح والرشاد في البشرية كلها وفي نفسه بدساتيره العامة في الانتاج والتوزيع والاستهلاك وغيرها من متعلقات الاقتصاد كي تتفرع منها شبكات الشفاء النفساني والعقلاني والجسماني بقنوات ناقلة للخير على قدر تعداد الناس في الارضين. ولو كان قد الجم شهواته وشكم

رغباته وتقمع نزواته لبادر الى تحجيم الخبث في نزعاته دون انتظار الثمرات من مشاريعه المديدة في الشفاء والنقاء والرواء بعد عشرات السنين فانها في احسن حالاتها وانجح نهاياتها تزرع بذرة السلامة والاستقامة في الضمير والبذرة متاحة لطالبها بلا مشاريع ولا دساتير اذا صدقت نيته في الاحسان وبزغ الرشد في بصيرته واينع في سريرته. ثم انه لا تعارض بين السعي في الخير العام من مظانه الواسعة العميمة وبين اختصار الطريق الى تنقية النوازع بالعلاج الذاتي المباشر، فالاقرب الى البديهة ان يتوازى العلاجان ويتزامن الجهادان في قهر المصاعب، فكيف يتسنى تسليط الضوء على الدنيا من عقول تعمى عن ظلام ذاتها واين الصدق في موعظة انسان يتهرب من تبعاتها وكيف الركون الى نصح طبيب يداوي الناس وهو عليل! وليس بالناس صبر يسيغ في مذاقهم تحكم المتعلم وتعنت المتفلسف وتدلل المتثور صباح مساء على ناصية الشارع وفي جنبات الابهاء والقاعات وعند نضح العرق في المصنع والمحلب والمزرعة بانتظار ان تترعرع فسيلة الوعود نخلة تساقط عليهم رطبا جنيا، بعد ان تستحيل العظام رميما في القبور.

فالناس اكثر ترحيبا بارتفاع الثقل عن كاهلهم في نهارهم الطالع وترك المستقبل لاوانه، وهم اقل احتمالا لضيق يرتاح به متسلط يبذل الوعود المفلسفة من لسان سوطه، وتلك واحدة من الحقائق التي تديم في الناس وشائج انسانيتهم وتبقى عليهم احاسيسهم في الفطره القابلة والرافضة فاذا ماتت فيهم او تهرت تحت ثقل القمع استحالوا آلات منصوبة تتحرك متى ما أدار الرقيب المسيطر عليها مفاتيحها. وكان السجادى تلميذا في مدرسة التمسك بالانسانية على علات الاحوال وسلك فيها سلوكا خليقا بالكرماء بغير ضجيج احدثه او اقتحام تجشمه او تباطل تكلفه. وضرب في منهجه مثالا للسالك اذا اقتداه فاز بالنظافة واغدق بالحسنى واثمر في الكرامة وشرع الى الامان بل ضيق الميدان بوجه الغالبين على الارادات والقابضين على المصائر فان الجيوش المجيشة للقهر تقل زادا وعتادا بزيادة الارادات القادرة على الانكار والاستجابة والفارقة بين الفضيلة والرذيلة والمختارة في القبح والوضاءة. ولربما صح القول بانه كان في جهاده الدؤوب يمارس اسلوبا وافق طبعه الدمث فاتسق فيه على وجه من الوجوه مع الكفاح السلمي الذي قاد به

غانـدي جهـاد الـهنـد الى الانتصـار مع فارق في الظـرفين وتفـاوت في الاستطاعتين تلمحه النظرة الخاطفة وتجد فيه عذر السجادي في قصر الباع فتقر بذلك ضخامة ارادته في المثابرة نحوا من سبعين سنة بين اول انخراطه طفلا في مشارف دروس الدين وبين آخر خفقه من قلبه لفظها في صومعته ببيته على مشهد من كتبه وكراريسه وقراطيسه. لقد كان امتداداً مع الممتدين في مناهج الخير منذ شع الخير قبل الاف السنين، والتقط خيطه الدليل الى الصواب من خيوط منائر الاسلام الجهابذة فاجتمعت فيه اشعاعات من اعلام الظـاهـر ولمحـات من فيـوض البـاطن وتضافر على ارادته عمر وعلى واشتجر على يقينه الشافعي والحلاج واشتبك في نسيجه الحنفية والنقشية ونطق في واعيتـه الشهـرزوري[1] وكـاك احمـد، وتنـاغمت دفـوفه على ترتيل الحق من اولئك فحبا في محاريبهم طفلا ونما في رياضهم فتى وسعى في ميادينهم كهلا، بيده قلم استعاضه عن المتفجر والقاطع فسدد الى المقصود نفاثات من الكلام المصفى والبيان المجلى والبلاغ الفصيح: لمسه اشفى وهمسه احلى وقبسه اهدى. واختلطت بسريرته سرائر اولئك وسرت في عروقه حرارة ايمـانهم فنشـط على حمـاسهم في مجـاهـدة النفس بصـرفهـا عن المشتهى الـوبيـل والمـرتقى الـذليل وبدفعها في الاستقامة على السكة المرضية حيث افتـراش الثـرى والنـوم على الطـوى ثمن ميسـور في ارتقـاء درجـات السلوك واعتلاء مقام الشهود الى مذبح تسلخ فيه النفس عن جلد الطمع فتقمع في شرنقـة القنـاعـة وتقمـط في اغطيـة السكينة والرضا بالمقدور. وتعاورته الايام فتقاذفته الاحوال في باكورة جهاده بين السـهل والجبل طي الوبر والمدر في البدو والحضر من فجاج كردستان وشعابها وهضابها، ثم انسابت به الاقدار من النجود الى البطاح فحل في بغداد يعيش من زهيد الراتب في المسجد وينبعث من موفور النشاط الى مطارح الثقافة وبيوت الطبع والنشر موزعا بين اهتمـاميـه الاعظمين: في الثقـافـة الكـردية من باب الوفاء للمنتمي والخدمة الاسلامية من باب الثبات على العقيدة، فكان يبذل لهما من ذات نفسه باكثر مما يستحلبهما لذات نفسه وليس هذا ولا ما كان من تنقله في كتاباته بين الجمـع والتأليف او من ارتحـالـه عبـر مطـايـا الـوفاء الى مرابع طفولته ومراتع رجـولتـه في اديم كردسـتـان المغضن بالامـر الذي يأسرني فيه ويقصرني عليه

فقد قيل في ذلك وسوف يقال اكثر من ذلك فما به خفاء او حاجة الى جلاء، فالمعلمة الشاخصة بين المعالم المميزة له هي اطراد سلوكه في المحمدة والنظافة خلال مضايق العيش في مغالبة المغريات على الطمع والشطط فما هان له عزم على العسر ولا لانت له قناة في المحنة. وطفق يخصف عليه ثوب الحشمة من (مغار الفتل) في الاباء بيسر متساوق مع طواعية طبعه للجريان في مسايل هداية الاسلام والسريان الى حيث يحتمله مهب المواعظ من تراث الفحول الاقدمين. واني لاخاله قد الف خلقهم المروي في الاسفار واستأنس بطيب النشر من احوالهم فمال طبعه الى الانطباع بميسمهم ونازعته نفسه الى القدر المتيسر من التشبه بهم فمكنه ذلك من احكام القبضة على عمامته فلا تطيرها من راسه العصرنة والتحديث كما اطارت من رؤوس منتصبة على قامات اعلى من قامته. واذا اعجزه الامكان ان يقاربهم في التبحر والتحبر فقد اسعفه الجهاد ان يتابع شرعة مهدوها للمقتدي ويستضيء شمعة اوقدوها للمهتدي. واراحه ذلك في اختصار السبيل الى محجة الكرامة فلم يترقب للاستقامة يوما تتحقق فيه بشارات المتفلسفين باستواء الخلق ونضج الحكمة في الناس حين يعم الشبع ويشيع العدل في الانصبة ويزول تميز السيد من المسود، فقد حمل نفسه على تحاشي الالتواء الناجم من تحكم العوز واستشراء الظلم بذخر معنوي في دخيلته جمعه عبر العمر من سنابل الحكمة في بيدر التراث واضاف اليه حبات اللؤلؤ المنتثر من سمط الجلوة في الامثال فما تمحل في ذلك ذريعة او تأول عليه شريعة، وصحت نيته في الحق المنزه عن الذرائع والاسباب فأتبعه باصرار انسان يشطب من مواقيته يوم الامان والضمان والطعام ويشترط على نفسه زيادة التمسك بالمنهج على قدر الصعوبة في الامتحان اذ تفتر الهمة في مقارعة الطمع بالفقر ومغالبة القهر بالضعف ومتابعة النقاء في المباءة. ويا هول ما يوشك ان ينفثه قلمي في تصوير بلواه حين اذكر كيف كان يأوى بدينه وايمانه وعرفانه الى مسجد فيما يلي الحيدرخانة باتجاه ميدانه، فاذا استدار في العطفة نحو محراب امانه كانت خطاه العشرون الاخيرة الى باب المسجد هرولة المستعيذ برب الفلق من شر ما خلق، ولياذ المعتصم من الفتنة بالخرس والعمى والصمم وطرد السبيل الى السلسبيل في اودية من نار، فقد قضى

الاربعينات والخمسينات في برزخ على مشارف الغواية المشرعة الابواب للفجور فكان في مقام فلق الصبح الفارق بين الضدين.

اڤٍ لها من حياة تبلو الصابرين باشق المكاره على احتمالهم فكان ما كان من اتساع احتمال السجادي للبلاء كسعة صبر الشهداء وثابر على جمع الرحيق المكتنف بالشوك غذاء لروحه ونماء للناظرين الى دأبه في العطاء واستقامته على سواء السبيل، واصبح بما يمثله من امتداد لتراث اعتاض عن المال رشدا الى الصواب وسكينة في الاستواء وبما يقدمه في كنف العقيدة من ثقافة تضيء العقول من كل صنف، اصبح به برهان الانتقاض لحجة من يسخف التراث اساسا في القناعة وحافزا على النشاط ومنطلقا الى الجهاد وقائدا الى صوالح القيم. ولقد اعيت الحيل همما كثيرة تسلحت بالوسيلة الدنيوية في التثقيف والاصلاح والخلاص فصرفتها الخيبة عن مواصلة التبليغ حين وجدت المسافة شاسعة بين ضخامة الدعوى وتفاهة المنجز وبين بعد المستقى من بشاراتها. وحصل الخمول في انماط المتشددين بحلولهم المغالية فتقهقروا الى مثل النظرات التي تطالع بها مدرسة السجادي شؤون الحياة في معاشها ومالها وانتقالها اطوارا. وتقلبت الاحوال بالمثقفين ذات اليمين وذات الشمال وذات الوسط في مخاضات عسرة متشنجة متوترة، يسيل منها دم ولا ينطلق مولود، فاختلطت الصفوف وتداخلت الحدود وضاع اليسار في يسار اليسار ورفع اليمين شعارات يتهيبها اليسار ويجزع منها الوسط، فالغليان الشديد في المراجل ظل يخلط القعور بالسطوح عبر الوسط نزولا وصعودا. وبقي السجادي على ابان العاصفة في اواسط عمره نباتا راسخ الجذر بمنبته: له تأصل فلا ينقلع وبه مرونة فلا ينكسر وعليه ثمر فلا ينقطع، ونار تزحزحه عن موطىء قدمه الواحدة بتدافع المتزاحمين من حوله: قسما بالايمان. ان ما اثبته في العاصفة ضفيرة من انوار الفرقان مجدولة بقبضة من اخبار الرسول والأصحاب على حبكة من هدايات الخطاب والكتاب تسلسلت اليه من نيف وثلاثة عشر قرنا عليها شارات وامارات من جبابرة الحق الذين قضوا انحابهم (وما بدلوا تبديلا).

فيا راحلا بلا غياب.. ياغائبا بلا احتجاب! ما كان لأشد اوهامي ايغالا في الخيال ان يتصورك ميتا اقوى حضورا منك وانت حي، فلقد كانت في

حياتك فسحة التأميل فيك ترفد اناة المصطبر عنك فاستحالت بعد موتك ظمأ يضاعف الاوار في روح المتعطش اليك.

وتحولت عن رجاء المترجي فيك الى يأس المفتتن بك وقطعت بالموت ما كان من صلة التـواصـل بينـك وبين اصحـابك واحبابك من اكرادك واعرابك وقمت عنهم مقام المنشغل بخلوده عما سوى معبوده وقاموا عنك في محزنة تعصر القطرة من عصب تجملهم عبرة وتفجعا، وعلى قدر ما كان وفاؤك بحق المـوت فيـك هو خلوصـك اليـه بالانسـلال من الصـلات والارفضـاض من التبعات. كان استيفاء الموت لحقك في ذمة اصحابك هو اضافة الوقدة الى ادامـة فكـرهم فيـك وتشـديـد الحـرقـة في اطـالة ذكرهم لك وفتل اعصابهم بانشداد نزوعهم اليك. فاذا ما ادمت في دربك عين المتعشم والقيت الى مهبك اذن المتسمع وتوسلت بمغالطة النفس في قهر اختفائك ارتفع سدل الموت خانقا للعشم صارفا من صنوف الرجاء الى الياس في غير ذكراك الثابتة بضميري وهي مشرقة في ذاتها تزداد التماعا بخلد المحاور مع ظلال الموت: مغدقة بتعدد لوحاتها، يضاعف مقدارها وضوح دلالاتها على المعيار الخالص من شوائب الحياة في التحيز والتحامل فهي في حرز المؤتمن عليها من مظنة الامـالـة الى غيـر وجهتهـا وقـاطعـة بعصمـة الموت لفرندها في البرهان على سجاياك ونواياك وطواياك.

وما كان لهذا القلم الذي يحيل مداده نورا في سطورك ان يتشفع بالادلة في تنزيه انسيابه عن الميل، فانه قسما بالنون والقلم وما يسطرون لم اجد قط وسيلة أوفى بفروض اخلاصي للاحياء من صدق المقال وما مرت بوهمي صورة لقبح النكاية بهم اشوه من التوائي عليهم في البلاغ، وخاطبت فيهم مدى العمر عرقا ينبض بمكامن فضيلتهم استفزه في مقارعة العروق النابضة بالعدوان في اغوار النفس الامارة بالسوء، فانت تعلم انه قد تقع كلمة الحق موقـع القبـول من قادر على الخيـر مانـع للشـر، ورب سانحـة رفعت الخطرة الطيبة الى موطن القناعة في واعية تتسع استطاعتها لاكثر من اتساع توقعي فيكون حجبها في هذه الحالة حجبا لنعمة كبرى اماتها الاحجام. ولا ضرر على احد في خيبة الامل من كلام مخلص لايصل الاسماع الا ان تكون خيبة صاحبه في عقم نيته الطيبة، وتعلم اني صرفت خطابي عن المسكين

الكادح في توثير كفافه فان غاية ما امنع من نهمه بيض دجاجة او قبضة من بصل، واقصى ما اشحذ من همته سعى في اماطة الاذى عن الطريق، وهو على اى حال لا يقرأ ما يكتب وقد لا يفهم اذا قرأ او يضيع في الكردية، ولربما خاب في العربية، ولما كان عزمي صدق في تحري الجدوى للناس بما اكتب فقد انحصر همي على وجه الضرورة في مخاطبة العقول المستنيرة في الهامات المنتصبة بين المناكب التي لها حول يخشى بأسها ويرجى نوالها. وانه لخليق بذكراك ان ينفتح فيها النجوى على لمحات منك تجلو مقامك في الاحسان وشجبك للاذى وبرك بالاباعد والاقارب وما الى مثل ذلك من خلائقك السمحة التي يحمل ذكرها بارقة من الامل في التأسي بها وقد اشتدت الحاجة الى تقليدك في اتباع (ادفع بالتي هي احسن) واصطناع التجاوز عن الخطأ والغض من الشطط وحمل الهفوة على السهو والنسيان فقد كنت تدأب في تضييق الفجوات وسد الثغرات واختزال المسافات بين القلوب المتنافرة وترد عذر مقترف المكروه على حكم الاحوال وتدعو بالمغفرة للمسيء بحسن نية او بسبب لايدفع وكان الله غفورا رحيما.

عرفتك عن كثب لاكثر من اربعين عاما انقضت اوائله في الحرب الثانية ودامت بقيته في سلم مشوب بالقلق تراوحت احوالها بين الشدة والفرج، وزاملتك في المجمع الكردي سبع سنين نبذر فيها ونعصر ونلتقي ايامها ولياليها متحاورين في المهام المرتبطة بالتزاماتنا المجمعية والمنشعبة من واجباتنا القومية والاجتماعية ونطرق كل باب من ابواب الكلام اتسعت له معرفة العصر وانجمته شبكة تعقيداته ونتباحث في اكثر الامور دقة وحساسية من دين وسياسة وقناعات في الحياة وسبل الى الخلاص: قطعنا مديات الكلام صعودا ونزولا وضربنا في جنباته يسارا ويمينا وغصنا في اغواره باديا وكمينا فما وجدتك ابدا ابدا ابدا جاوزت منطق الحكيم الساعي في رأيه بالحلم واللين ولم يرتفع صوتك مرة واحدة فوق ما يسامح فيه طبعك الهادىء من حماس واكثر مما يبيحه توقيرك البالغ للعشير. واذا استفزك منطق لاترتاح اليه لم يظهر عليك من اثره الا مسحة من التوتر في ناملك الممسكة بورق اللف حول تبغ (بالك) و (شاور) في تلطيف مزاجك ثم تطاير ضيقك بالمسموع بددا مع الدخان المتصاعد من سيغارك. عفا الله عنك في بعدك

المتنائي عن الخشونة: فقد عز بعد المعزة وندر فوق الندرة ان يكون سمعي التقط من كلامك نبرة تدغدغ عصبي فتسعفني في حزني عليك بامتصاص شيء من فجيعتي فيك، فهلا كان لك ندحة من مطلق الحسنى الى شيء من مألوف الخلق في الرقة والغلظة يستوي بك في خلدي على محمل العزاء في فراقك؟ فاني اتحايل على ثاري منك في وطأة موتك على جلدي وخلدي بالتعابث مع الكلام فاذا قالوا في تواضعك، نقضتهم بتعاليك على المتعالي، واذا اطالوا في زهدك اشرت الى طمعك في المتاثرة. واعارض اطنابهم في ادبك وعلمك وخلقك بالاطناب في بيات سعيك للاستئثار بالفضل والاحتكار للمحمدة والمسابقة الى الحسنى فأصفك بجامع ثروة في المعنويات الجليلة وطالب دنيا من القيم القويمة دونها البهرج الزائل من لألاء الدر والياقوت وخيلاء الجبروت والعظموت. واتهمك باتساع الطمع الاكرم الامثل حتى جاوزت فيه حرص البخيل على اكتناز الذهب فيا لك آلله من راحل يثأر بعطره من زهره ويوكل لومه الى كماله ويستجار في التثريب عليه بأحلى شمائله وخمائله. كرمت من ميت ورث الحمد من فضله وهو حي.

وانكشف لي في محاوراتنا منهجك في رد المتحامل وصد المتهاجم فقد وجدته من مذهب (ابي ذر) حين اقذع فيه شاتم فقال له: (يا هذا لاتقذع ودع للصلح موضعا فانا لانكافيء من عصى آلله فينا بأكثر من أن نطيع آلله فيه) فقد كنت تحذف من قدرتك في الرد على المتجاوز مقدار ما يحذف هو من امكانه في زيادة الصفاقة. واني رأيتك تسوق من الاسباب في معرض الامتناع من الترحيب ببعضهم مالا يبلغ نصاب الاقناع فلما انكشف لي مع الايام معدنه علمت مقدار مجاهدتك للنفس في صرفها عن ذكر مثالبه فلربما كنت قد اقتصرت فيه على كلام اذا قيس الى حقيقة اخلاقه دخل في باب مدحه، غفر آلله له واجزل فيه ثوابك.

ووجدت فيك خلة هي تاج الفضائل في المعايشة ولو شاعت بين الناس ولا سيما القادرين منهم على التأثير، لانطوت صفحات كثيرة وخطيرة من المصائب والخطوب فقد دفعك ميلك الفطري الى ترجيح التفاهم على التخاصم وايمانك الجذري بافضلية التقارب على التحارب الى رؤية ما لاتراه الاعين المتحرية عن اسباب الشقاق والفراق فقد تهيأ لك ان النقطة التي

يفترق فيها الاطراف هي ذاتها النقطة التي فيها تلتقي فالمفارق هي في الحقيقة مجامع، وسرة الخيطين المتصالبين التي تتباعد عندها الاذرع الاربعة هي مركز اتصالها. وبقدر ما يكون استمرار الاذرع الاربعة في الابتعاد بعضها عن بعض هو دوام في الشتات الى غير نهاية يكون رضاها بالاجتماع في الملتقى على المصلحة المتاحة انهاء لعمليات الذبح والسلخ والتقطيع في الاوصال البشرية.

ولست ازعم ان هذه الرؤية كانت وليدة فلسفة اطلت فيها تنظيرك وادمت فيها تجريبك فانك ما وقفت في الحياة موقف المصرف للامور والمشارك في الاحداث والمتراجح مع الامواج في معتكفك الذي ارضاك بالاقتصار على مشاركة الناس في مشاعرهم الطاهرة وبذل المشورة المخلصة لطالبها وعرض الخير الذي انت قادر عليه والوقوف باكيا في المحزنة العامة والمنتبذ من المآدب مكانا قصيا، وانما هي رؤية الفطرة السليمة المفرقة بين السراء والضراء، الناجية من اسار الفلسفات الملغية للاحساس السليقي بالصحة والمرض، وسهل على ادراكها فيك بسبب التوافق بين اثر الفطرة في رأيك وبين مكانة المعاناة في قناعتي، فما من خلاف بين المختلفين الا في الاقل الاندر يخلو من وجه وفاق تجتمع عليه الضمائر المستنيرة فتدفع به النفرة والجفوة وتتخذ سمة المرور الى رحاب الوئام والركون الى سكينة السلام. وما يتجاوز عنه كل متخالف من خاصة مصلحته ثمنا في شراء الامان هو في اي معيار يرصد تذبذب الربح والخسارة في كفوف التعامل، فوز بالمغنم العظيم المتحصل من توفير الصرف في التخريب ومن حقن الدم المسفوك في المغالبة ومن ذهاب المصالح وبوار المتاجر وخراب المرافق من (بئر معطلة وقصر مشيد) فاذا استطاعت النفوس ان تنبذ الاثرة في تحكيم خالص المصلحة لمنع ما يشتجر من الخلاف وتركت حب القهر والرغبة في الارغام والمغالاة في المطالبة وقدرت اشراقة المآل في الرضا بالحق والاكتفاء بالممكن تهاوت العلل المعللة للهضم والقضم وكسر العظم ونشر النظم واشعال الحريق. الا ما كان من الخلاف على المصلحة الحقيقية التي لا امكان للتصالح عليها في مفاهيم هذا العصر ونواميسه فقد تطابق فيه رأيانا من حيث انه شر لابد منه حتى تخطو الاخلاق العامة نقلة اخرى الى الارتفاع

بالنوايا فوق مستويات الطمع المبرر والسطو المعلل ويكون نكاله في القياس الى مجموع النكال الارعن الناجم من السخف والسفه والغلظة والعزة بالاثم وما اليها كالخسارة الواقعة من التهام الذئب لشاة واحدة في دفع جوعه بالقياس الى فتكه بعشرات الشياه في اشباع غريزة الفتك فيه، وما اكثر م مثلنا لصدق هذا النظر باشخاص نعرفهم جمعوا من الثروة ما لوا استغنوا ب عن مشقات الكسب لكانت فيه الكفاية بل التخمة لحفدتهم من الدرجة العاشرة وهم مع ذلك ساعون سعي الموشك على الموت جوعا وعريا في ضم الحرام الى حرامهم بنهم لايعرف حدا او صدا ولو تفطنوا الى انه بمثل ما يضيق القبر عن غير الكفن الساتر للمكفون، تمج الدنيا الحديثة ثراء غير متوازن مع مستلزمات العصر وتلفظ شرهاً يخطف اللقمة من فم المحتاج وبطرا يستخف بآهة الملهوف.

تحاورنا في ذلك وفي امثاله فتوافق او توازى فيه رأيانا ولربما عز التوافق والتوازي فيما لاخطر ينجم من تنوع الاجتهاد فيه وبقينا ابدا نرضع الود من حلمة الصداقة. وعهدتك دائما تسبق توقعي لحرصك على التزاماتك فلا نكثت قط ايا من وعودك ولا خيبت ابدا رجاء الناس فيك او اخلفت ميعادا موقوتا عليك.

ولم يكن الوفاء بالوعود والعهود من ثلث القرن الاول لسكناك ببغداد هينا على انسان مثلك لايملك لتنفيذها غير طاقة بدنه وفتقة ذهنه فاذا سعيت فيها طويت المسافات المقدور عليها بالمشي على القدمين توفيرا للافلس المعدودات في ثمن تذكرة الحافلة، واذا بعدت الشقة ركبت الحافلة قصورا عن اجرة التاكسي الثقيلة على الجيوب الخاوية. وكلفة الذهاب تتضاعف في كل مرة بالاياب من الموعود الى بيت الله حيث تنتظرك صفوف المصلين وراءك.

وكان مما تحسب له حساب المرتبط بالايمان المغلظة ان يكون رجوعك الى المسجد قبل موعد الصلاة بزمن يتسع لقطع مسافة الرجوع مشيا اذا عز الصعود الى الحافلة مع المتزاحمين بالمناكب. واكبرت فيك هذا الحرص على مواعيدك في اوقات الطاعة باكثر من اكباري لحرص المناضل على المشاركة في مظاهرة او مسيرة فالالتزام باوقات الصلاة خط ممتد في العمر

كله ومتكرر في اليوم الواحد اكثر من مرة ويزداد الوفاء به صعوبة مع التقدم في العمر وتزايد الازدحام، ولولا انك حفرت بصبرك في قرارة ارادتك آية (فاستقم كما أمرت) لكان مما يتيح لك التساهل مع النفس لجوؤك الى التأول[1] من زاوية حكم الضرورة ورخصة الصعوبة وان آلله يريد بالناس اليسر لاالعسر.

ماذا اقول في ختام نجواي اليك؟ وهل في القواميس ما يختتم به التوديع في ذكراك بعد الرحيل؟ كيف المنصرف من لذاذات الخواطر المنثالة من الانشغال بطيفك؟ إني اذا جلت بقلمي في تصوير مكانة جهادك الادبي في وجدان شعبك بنفضك الغبار عن كنوزه وكشفك الستار عن رموزه احتجبت بدنياها الجميلة عما سواها وطفت في خمائلها بين رياها ورؤاها عبر سهولها ورباها وعلى حواف سمائها في ذراها التقط من درها نجما في رجم الهموم العوابس واضم من زهرها تاجا على هام العرائس من بنات افكارك فلا انتهاء لي من اجتلاء وجه الحسن من اثارك واخبارك واطوارك.

فاذا صرفت عنك فكري الى الوداع عاد اليك قلبي بتحية المشوق وقام انسه بك مانعا من الرجوع فما اصعب انفصامه عنك ثم ما اشد حاجتي الى استلال فكري وقلبي من مشهدك هنيهات فقد آن أوان تعزية أمنا كردستان فيك بعدما ثبت يقين موتك في الافهام وصح رحيلك عن الاحياء. ولي بسمع قومك همسة ينقلها اليهم قلبي وفكري فانك:

ديسان به كوردى زيندو دەبيەوە

بۆ كورد لەو دونياش تێ هەڵدەچيەوە

«ستنبعث الى الحياة كرديا مرة اخرى»

«وتستأنف الجهاد من اجل الكرد حتى في أخراك»

---

(١) هو ضياء الدين مولانا خالد.

العراق ١٩٨٥/٢/٢٨

# خوزگە ڕێزی زیندووش دەگیرا

● سەعید یەحیا ●

چلەی ماتەمینی «سەجادی» ی نەمر کراو، کۆمەڵێ مامۆستای پایەبەرزو بەڕێز هەستی دەروونیان دەربڕی. . هەندێکیان ئەوەندە پڕ ئەندێشە ئەو هەستەیان گەیاندە گوێگرو ئامادەبووان، ناچاریان کردن یەك دوو دڵۆپ فرمێسکی گەرمیان لە چاوان بێتە خوار. . . یا هەرنەبێ لەناخەوە کاریان تێبکاو بەکرێو بەهێمنی بگرین.

ئەوانەی بە کوردی دەخوێننەوەو بە کوردی دەنووسن، دەزانن خوالێخۆشبووی هەمیشە زیندوو، چ خزمەتێکی بە مێژوو و ئەدەبیاتی ئەم قەومەی خۆمان گەیاندووە. . دەزانن چۆن چراو مۆمی لە شەوەزەنگ و تاریکاییدا داگیرساندووە. بەڵگەو مەدرەکیان ئەو هەموو میرات و کتێب و وتارە بەنرخ و بەکەڵکەی لەدوای خۆیەوە بەجێی هێشتوون، لە کاتێکدا کە نووسین و بڵاوکردنەوەی کوردی ئەوکاتە بە چاوێکی نزم و سووك تەماشا دەکران و، کەسانێك لە مەیداندا گورز بەدەست و سنگ دەرپەڕێن بوون، ئەوەی بیریان لێ نەکردبایە ئەوەبوو بە کوردی بنووسن و بئاخێون.

خوا کاری ئە و مامۆستایانە ڕاست بێنێ. . ئیشاڵڵا خیلاف لە قسەکانیان نەبوە و ئەوەی گوتیان و گێڕامانەوە، هەر هەمان هەستە کە ئەگەر زیندوویش بووایە هەر وایان بەسەر هەڵدەدا و مەتح و سەنایان دەکرد. سەبارەت بە ڕەحمەتی، دڵنیام کە یەکێکە لەو چەند ئەدیبە کوردانەی نە دوژمنیان بووەو نە ناحەزو، دەستەیەك دۆست و برادەرو شاگردیان پەروەردە کردووە. . دڵنیام ئەوەی بەرهەمەکانی ئەوی دەورکردبێتەوە، ئەگەر نەشیناسیبێ، لەڕەحمەت بەولاوە هیچیتری حەواڵە نەکردووە.

کورت و موختەسەر، «علاءالدین»ی ڕەحمەتی، بۆ ئەدەب ژیاو بۆ ئەدەب سەرینایەوە. . زاتێکی وا دەروون پاك و خزمەتگوزاری قەومەکەی خۆمان هەر شایانی ئەم قەدرو حورمەتەیە و، لە ڕێز لێ گرتن بترازێ ستەمە و دەرهەق ڕاستی دەکرێ.

من خۆم حەزم بەوە دەكــرد، ئاهــەنگـەكـەی بۆی كرا، ئاهـەنگی شادی بووایـە. چونكـە مامـۆستـا «عـلاءالـدین سجادی» نەمردووە و، هەموو دەم و كات و سەعات و لە هەموو بوارێكدا، ناوی دەبردرێ و، ئەدیب نی یە، ئەگەر لێ‌كۆڵینەوە لە مێژووی ئەدەبیاتدا بكات، چەند جارێك ئەو نەكاتە شایەت و پەنجەی بۆ درێژ نەكات... بۆیە شادی و بەزم و دڵخۆشی، چونكە ڕۆحی خوا لێ خۆشبــوو، هەردەم بە ئاسمـانی گاڵتـەو گەپ و نوكتـەبـازیو قسـەی نەستەق و ڕووداوی سەیرو گاڵتە جاڕییەوە دەخولایەوە... پیاوێكی دەم بە پێكەنین و نوكتەحازر بوو.

ئەوەی لێرەدا مەبەستە بگوترێ.. ئەمەیە كە مرۆڤ خۆزگە بخوازێ.. كە چۆن بۆ مردوو كۆر دەبـەسـتـرێ، نەختـێ كەمتـریش ـ ئەگەر نەبـێ ـ لە پاشملێدا، بەدگۆیی و بوختان و قسەی ناشیرین و ناڕەوا بە ئەدیبان نەدەگوترا!

هەندێك حەسرەتی ئەوە دەخۆن كە پاش مردن چ فایدە بۆی بگرین و قوڕ بپێوین، ئەگەر لە ژیانیدا ڕوویەكی خۆشی ئێمەی نەدیبێ!

ئەمە خۆزگەیە.. بەڵكو بێتەدی..

**هاوكاری ١٩٨٥/٢/٢٨**

# السجـــادي
# خلد الشعراء وشعراؤنا عنه صامتون

● مصطفى نريمان ●

خلال الاربعين سنـــة من عمـــره الادبي كُتب الكثيـــر من المقـــالات عن الشعـــراء وحقق المـــزيـــد من النصـــوص الادبيـــة وخلد في كتـــابه القيم (تاريخ الادب الكردي) المطبوع عام ١٩٥٢ شعراء لفهم النسيان كبابا طاهر عريان واحمدى خانى وملاى جزيرى وملا ولدخان ومولوى وخاناى قبادي ومجدي ومحـوي وغيـرهم وغيـرهم كثيـرين، ناهيـك عن شعرائنا المعاصرين. اشبع السجادي الادب تحقيقا وتعليقا ودراسة وترك اثرا لايبلى.

مضى على رحيل السجادي نحو شهرين ونصف وكتب عن مآثره مجموعة من الادباء والمثقفين وباللغتين العربية والكردية واقامت المؤسسات الثقافية الكردية حفلا تأبينيا رائعا في ذكراه الاربعين القي فيه العديد من الكلمات وما زالت صحفنا الكردية تلقي المزيد من الضوء على سيرة هذا الاديب الالمعي ونتاجاته الغزيرة.

ومن نظرة عامة على تلكم النفثات القلمية والكلمات التعبيرية نلاحظ انها ادبية ونثرية لامكانة للشعر فيها. شعراؤنا المعاصرون والذين هم بين ظهرانينا - أمد آلله في عمرهم - انشدوا للرموز الصماء جبالا واشجارا ووديانا وسهوبا وغـردوا للبـلابـل والنســائم والليـل والنهـار والشمس والقمـر والنجـوم في كبد السـمـاء. دقت قلوبهم لشعـوب آسيـا وافـريقيا وامريكا اللاتينية، ملأوا الدنيا صراخا، اضحت جرائدنا اليومية والاسبوعية ومجلاتنا تضيق ذرعا بقصائدهم الرنانة ولكنهم ومنذ رحيل الاديب المعروف علاء الدين السجادي لم تهزهم المناسبة بعد ولم يعبروا عن مكنوناتهم ولو بابيات قليلة، ياقوم ماحدا بكم قليـل من الـوفـاء لمن خلد شعـراءنـا، الى متى الصمت ياتـرى، هل تهـزك الاريحيـة وتنشـد لبعـد آلاف الكيلو متـرات وتصمت امـام هذا النصب الذي رحل وغاب، هل التزم الصمت على صمتكم ام أتلو الآية الكريمة (والشعراء يتبعهم الغاوون).

العراق ١٩٨٥/٣/٢٥

# سەجادی
# لەسەرەتای تەمریدا

● مەسعوود محەمەد ●

**ئەم ئەرزە گێل گێل بەئاسمانی**
**بەریندا دەخولایەوە بەرەو هەوارێك**
**قورسایی تەرمی وەهبی تیدا هەست پێ**
**کردبوو بەسەر تۆپەڵەی سەریەوە..**

هێشتا سووری تەواوی نەدابووە
ملی کەوتە سەر سنگ لە ژێر قورسایی تەرمی سەجادیدا..
ساڵێکی نەبردبوو چرای دوەممان کوژایەوە..
چرا نەکوژایەوە، وشکایی نەوتی هات..

سفتوسۆی مەرگی غەریبانەی وەهبی جارێ لە دڵاندا کزەکزی بوو سەجادی پشکۆی تازەی نا بەجەرگەوە..

ئەرزی خۆمانەو دەیناسم: ناتوانێ بەکەللە دوو کەڵە مەیت هەڵگرێ. گەردەنی چەمایەوەو دەستی نایە ئەژنۆی.. لەگەڵ خەڵقدا بۆخۆی گریا:

خۆت خۆش ئەرزی مادو زەردەشت!! لە جەزیرو بۆتانەوە بە بادینان و بابانەوە تاموکریان و ئەردەلانت.. خۆت خۆش هەموو کوردستان لە سنووری نادیارتەوەتاسنووری نادیارت.. خۆت خۆش بەبەرگی سووری شەهیدەکانتەوە.. بەدایکە بێ ڕۆڵەکانتەوە.. بەباوکە کۆست کەوتوەکانتەوە.. بە ئاودێرو سەپانتەوە.. بە ڕەنجبەرو گاوان و شوانتەوە.. بەخاك و ئاوو ئاسمانتەوە..

ئەوچاوە بەئەسرینەت لە سەجادی لاربکەوە.. بەزاری منەوە زمانی گلەیی لێ بزێوە.. تۆ دڵت نایەت؟ من پێی دەڵێم: چیبوویت بەبەژنی کورت و چاوی کزو عەمامەی سپیتەوە ئاگرت بەردایە وەجاغی نووسینی کوردیو پشتت تێ کرد بەرەو چاڵی مەرگ. دەك ماڵی مەرگت برمێ، وەی خانەی دوای

مەرگت. . . خانەی دوای مەرگت با نەشێوێ! چ بشێوێ هەموو کوردستان و فەرهەنگستانە:

دەمبیەیت؟ یان:

**ئەوەندە خ ، لە جەستە بارە**

**نە جێگای ب ن نە ڕێی گوفتارە**

دەمبینیت؟ یان پەردەی ئەستووری مەرگ نە چاو تێی بڕ دەکات و نە چاویلکە. . دەسا پەردە هەڵدەوە. . پەنجەیەکت لە دامەنی چەنگاڵ بکەیت، بە سەرەتاتکە لەم دیوەی پەردەوە هەزاران سوختەو هەڤالی خۆت دەبینیو لە جیهانی بووندا بۆت نیوە مردوون!!

بۆ دڵیان نادەیتەوە؟ گوڵمێك لە گەوهەری ڕشتەی مرواریی مەرگستان، لەژێر لچکی پەردەوە بپڕێنە ناو خەونیانەوە خۆ تۆ ئیستا گەوهەرچنی نالیو ڕەزاو حاجیت!

تیشکێك لە ڕووناکی نۆدێیی کاکە حەمەدو مەولەویو مەولانا بە پەیکی فریشتە بۆ مریدەکانت بەرێکەیت!!

تاوێك لە گەرمەی تەقریری حەیدەرییان و جەلییان و قەرەداغییان و ڕۆژبەیانییان. . لە مصنفەوە. . لە بێتووشییەوە. . لە پێنجوێنییە وە بەرەو وەجاغە ساردو سربوویەکانەوە گەرماژۆ بکەیت!!

هەڵکشێیت بەرەو شادگەی گیانی جەزیریو خانیو هەمەدانی، حۆش و خرۆشێکی مەجزووبانەیان لێ بخوازیتەوە بۆ کۆڕی ڕەشپۆشی تازیەدارەکانت!!

مژدەیەکی ئاشت بوونەوەی ئیبنو ئادەم و میری ڕەواندزمان لێت دەوێ لەبری قورئانی سەر قەبرت!!

ڕازو نیازێکی بڵێسەداری بەدرخان و شێخی پیران و خولەو قازی بە گزنگی خۆردا ئاوەژووی بەفرستانی هەواری چۆڵت بکەیت!!

لە دەشت و دۆڵە گوڵ گوڵییەکانی بەهەشت «گەشتی بکەی» بە پرسش و تەفتیشی خوارو ژوور»، قارەمانی لەبیرکراومان بدۆزیتەوەو فرمێسکی

خەفەت و کەسەری فەرامۆش بوونی بهۆنیتەوە بە «رشتەی مرواری»و لاگیرەی کیژی بێباوان!!

بۆ ناکەیت؟ خۆ تۆ بە زمانی هەموو دوایت و لەگەڵ هەموان ئاشنایت! پەنجا ساڵە بێتەلی هەستت خەبەری مردووان بۆ زیندووان سەرقەبر دەکاتەوە. لەوەتەی بیردەکەمەوە خامەت بێن و بەرامەی مەرگستانی بلیمەتی کورد لەرووی کوردەواری دەپژێنیت و بە زیندووکردنەوەیان تینێکی نوێ لە گیانی زیندوووان دەگێریت:

بۆ ناکەیت؟ خۆ ئێمە لێت بێنیاز نین:

چاومان لە رێتە.. ئومێدمان پێتە دوای کۆچیشت تیشك و پرشنگ لە پەردەی خەیاڵمان جیلوەبەست بکەیت.. کۆترو پەپوولەو بولبول لە پەلکەزێرینەی شەبەنگی گیانتەوە بە پانایی‌و بەرزایی ئاسۆی کوردستانی مەرگ تێگەڕاو هەڵفرێنیت!!

بۆ ناکەیت؟ خۆ دەستی زۆردارت ناگاتێ بتگێرێتەوە لە دەفەزەنی‌ی ئاڵقەی ئەو روح پەرانەی وەك خۆت گەرمە تەریقی ڕاستی‌و چاکەن؟ جەردەی فکرو ئازادی‌و ئاشتی دووربەدووری لە دۆزەخی ئەهریمەنەوە تێوەت ڕادەمێنن، بای بەهەشتی بن باڵ و شاپەڕت بۆیان دەبێ بە دەرمانی کوێری..

نە جندرمەو نە چاو سوورکەرەوەو نە خەفەکەرو نەفەسبڕی حکومەتستانی سەرزەمین هیچیان دەست بە قەمچی، ناگەنە تازە دنیای گەلاوێژو مێژووی ئەدەبی دیوی قەبرەکەت.. تۆ بەسەر باڵی فریشتەو پەرییەوە پەروازی گیان پاکانە لە گولگەشتی کوردستان دەکەیت و تریفەو بریسکەی شاپەڕی ژەنگار بەدەورتەوە دەبێتە ترس و لەرزی کۆمەڵەی نوختەی تەفتیش و عەسکەری (کوا هەوییەکەت).. رەهایت لە ترس و تەما، بێنیازیت لە نیازبەخشان، پەردەش هەڵستاوە لەنێوان دڵەکەت و کۆش و باوەشی ئەو دایکەی باری نالەبار لێتی دەشاردەوە.. دەستێکی بخەرە گەردەن و تێر تێر لە کەوسەری بخۆرەوە.. لە زەڵم و بیخاڵی مەلە بکە.. بچۆرەوە بۆ لای سەرچنارو:

**بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کودووراتی سەرزەمین**
**شاد بن بە وەسڵی یەکدی کە تۆی طاهیر ئەو طەهوور**

خۆ تۆ لە چامەی. . بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کودووراتی سەرزەمین
شاد بن بە وەسڵی یەکدی کە تۆی طاهیر ئەو طەهوور
خۆ تۆ لە چامەی نالیو سالمەوە شیرمژی ئەو سەرچاوەیەیت: تا ئەوەی شیری دایك لە ڕۆڵەی حەڵاڵ بووبێ هەر بابی ئەوەیە کە سەرچنار بۆ تۆ حەڵاڵە. . تافگە نییە لە کوردستان لە چاوی تۆوە هەڵنەڕژابێ بۆ حاڵی کورد. . هەڤاڵی چل و ئەوەندە ساڵەم!

تۆش ئۆغرت کرد بۆ دوایین قۆناغی چوون. . گەیشتیتە ئەو مەڵبەندەی کەس لێی ناگەڕێتەوە. . ئیستە وایت لە کۆچخانەی ئەبەد. . بەنۆرە یەك لە دوا یەك ئێمەیش تاڵە شەربەتی گیانەلاوە دەنۆشین و چۆڕبڕی دەکەین، لە تررووکەیەکی چاودا نێوانی ئەزەل و ئەبەد دەپێچینەوە بۆ نەبوونستان. . لە ئێمە بەدواوە نامزەدانی مەرگ لە منداڵدانی عەدەمەوە بۆ دنیاکەی کاروانسەرا ڕەنگ دەخلیسکێن و لێی دەردەچن. . دلۆپ دلۆپ ئاوی ژیان دەتکێتە ناو هیچگەی برانەوە. . نە دلۆپی ژیان دەوەستیو نە دەفری مردن پڕ دەبێ، هاوار بەماڵم!!

ئەرێ براله! مامۆستاکەم! چ باسە لەو خامۆشەوارە؟ ئەو خەڵقە چالاکەی بەر تیشکی ڕۆژ کە لێرە تێکیان دەهاویشت و کۆڕی ئاشتی و شەڕیان لە مەیدانی جەنگ و لە بازاڕی مامڵەت دەبەست ئیستە چی دەکەن لەو تاریکەمەنییە؟ بە چ زمانێك دەدوێن؟ چۆن تێك دەگەن؟ تۆ خۆت کە لێرە کۆترەی ئاشتیو ڕاستی بوویت چ بازاڕێکی کریارت هەیە بۆ چنینی تان وپۆیەك لەو قوماشە؟ بۆت دەلوێ گیانە لێك تۆراوەکانی سەر زەمین بکەیت بە هاوڕێی تەباوەرەبای ژێر زەمین؟ کەس گوێی لێتە ئەفسوونی شیعریان لێ بخوێنیت؟ کەس کاری پێتە بە ئیکسیری ئەڤین گەشەداری بکەیتەوە؟ بۆت سازدەدرێ ڕیزی نوێژکەران لە پەرستگەی ڕەنگ و ڕووناکی، لە دواتەوە، کرنووش ببەن بۆ نرخە زلەکانی ڕاستیو دادو شەرەف؟

هەر ساتێك و هەر كاتێـك دڵت لەو نشینگــە تازەیــەت تۆرا سلت لە نوێــژكــەرو گۆیدەروپــەنــابــەری بن نوای قەبــرستــان كردەوە، بادەوە بۆ مەینەتخانەی پاش كۆچت و لەنوێ ڕاپیزێنەوە بە چراغانی هاتنەوەت لە حەج. . بەهەموو عومرت دڵم لێت نەیەشاوە، دڵی كەست لێ نەرەنجاوە، ئەم جارەش وەفا بەوەعدە بكەو دڵم مەشكێنە: بگەڕێوە بۆ ماڵ و مزگەوت و كتێب و دەروێشەكانت . دڵ نیا بە! كەس بە مردووی دانــاویت. . تۆ لە مردن گەورەتری. . مردن بە شاقەلێكی كەوا ئاو دامەنەكەشت ناگات. . ناتوانێ وەك تۆز لە پێڵاوەكەت بنیشێ. . كە دەمگوت مردوویت لە پەرۆشی خێری ئەو فاتیحــانــەم بوو بۆت بەرێ دەكــران. . مردنی تۆ بەنــدە بە مردنی وشــەو ئەدەب و ڕۆشنــایی و ئەو خاكــەو ئەو خەڵقــەی مردنیــان بۆ نییــە. . كوردو كوردستان هەر زیندوون، تۆش لەنێوەندی دڵیاندا.

تۆ لەم دەمەڕا ژینی بی بڕانەوەو هەبوونی بێ كۆتایی بەسەردەبەیت.

نووسەری كورد ژمارە (١)ی خولی سێهەم ١٩٨٥

# له کۆچی دوایی ماموّستای نەمر عەلائەدین سەجادی

● کەمال غەمبار ●

چ کات مرۆڤ هەست بە نرخ و گرینگی رووناکی دەکات کە لە شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاوا لەپر چرا دەکوژێتەوەو لەو نیعمەتە خۆشە بێبەش دەبێ کە چاوی پێ رۆشن دەبێتەوە. لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە کە رووناکی بە ژیانەوە ببەستمەوەو تاریکی بە مردن، هەرچەندە لەلای ئێمە بووە بە خووو نەریت هەتا یەکێ نەمرێ نرخی نازانرێ.

من لەو رایەدام ئەگەر مرۆڤێ لە ژیاندا لەناو دڵ و دەروونی خەڵکا شوێنی گونجاوو شیاوی خۆی نەکاتەوە هەرگیز پاش مردنی ناکەوێتە بەر دڵان و شوێنی دیار نابێ.

ماموّستا سەجادی ئەو زانا دانایە یەکێك بوو لەو پیاوە بەنرخ و بەهایانەی لە ژیانی زیندەگانیدا جۆرە پایەیەك و شەخسیەتیکی تایبەتی هەبوو ، میژووی ژیانی بەڵگەو نیشانەی ئاشکراو روونن کەتاچ رادەیەك ببووە چرایەکی رووناك و دەسووتاو دەورو بەری خۆی رۆشن دەکردەوە، نازم حیکمەت گوتەنی:

**ئەگەر من نەسووتێم ، تۆ نەسووتێی، لەکوێوە رووناکی دەرچێ ، تا تاریکی برەتێنێ؟**

مایەی بەختەوەرییە کە من لە سەرەتای ژیانما لە ریگەی گۆڤاری گەلاوێژەوە ماموّستای نەمرم ناسی ، ئەو گۆڤارە بەنرخە دەرگایەکی نوێی بۆ ئێمە کردەوە، زۆر چاك لەبیرمە کە قوتابی چواری سەرەتایی بووم گەلاوێژ شیعری «نابەزین» ی فایق بێکەسی بلاوکردبۆوەو لە قوتابخانە پێیان لەبەرکردین و لەوکاتەوە هەر شیعرێکی بێکەس بلاو بکرابایەوە لەبەرم دەکرد وەك «داری ئازادی» و «نەسرین» و «کوردە بەسیەتی... هتد».
هێشتاش ئەو هۆنراوانەم لە بیرماوە کەلە کاتی خوێدا هەموو بەیانیان لە وەختی ریزبوونا بەدەنگێکی پر لە جۆش دەمخوێندەوە... ئیتر لەوساوە

گەلاوێژ بووە رابەری ژیان و زۆر زانیاریو بابەتی بەکەلك و سوودی لێوە فێر بووین. . بەراستی ئەم گوڤارە دەورێکی بالآی بینی لە ژیانی زۆر لەو کەسانەی فریای ئەو رۆژگارە کەوتن کە تیایا دەردەچووو مامۆستای نەمر گیانی خۆی بۆ تەرخان کردبوو. . گۆڤاری «نزار» یش کەبە کوردی و عەرەبی دەردەچوو پاش راپەرینی کانوونی دووەمی سالی ١٩٤٨ بووە ئابدەو قیبلەگای رۆشنبیران بە کوردو عەرەبەوەو دەورێکی مێژوویی دیاری بینی لە هوشیارکردنەوەی جەماوەری خەلکو بلاوکردنەوەی بیروباوەری برایەتی و رێبازی پیشکەوتنخوازی، زۆر چاکم لەبیرە کە چۆن خوێنەران بەتاسەوە ئەو گۆڤارەیان دەگرتە باوەش و بایەخی تەواویان پیٚ‌دەدا.

دەوری مامۆستا سەجادی لە کۆری رۆژنامەنووسیو بلیەخدان بە مێژووی ئەدەبی کوردو نووسینی چیرۆکو کۆکردنەوەی سامانی نەتەوایەتیمان وبابەتی مێژووو هەمە جۆرە دیارەو هەمیشە لەبەرچاوە.

مامۆستای نەمر زۆری بۆنووسین و ئیمەش قەرداری خامەی رەنگینی ئەوین و هەرچی بۆ بکەین هێشتا کەمە. بەلام بەداخەوە مەرگێکی لەپری جەرگبر بوو. ئیمەی کورد چاوەروانی بەخشندەیی و بەرهەمی‌تر بووین ، کەچی مەرگ ئەو وچانەی نەدا. . وا مامۆستای نەمر مالٔ ئاوایی لیٚکردینو لەبەرچاومان وون بوو. بەلام ئایا مردن ئەو دەسەلاتەی هەیە کە بەرهەمە بەنرخەکان و رەفتارە جوانەکانیمان لیٚ بشارێتەوە؟ ئایا مەرگ بە هەموو ترسناکیو توندوتیژی خۆیەوە دەتوانیٚ شوێنەواری دیاری مامۆستا بسرێتەوە . . . مامۆستا سەجادی لە ژیانیشا دیار بووو لە مەرگیشا هەر دیارە ئەویٚ خۆی تەرخان کردبیٚ بۆ بەرزیو پیشکەوتنی نەتەوەکەی گەر بشمریٚ هەمیشە هەر زیندووەو هەرگیز نامریٚ.

العراق ١٩٨٥/٤/٣

# ئاگری کۆچێك

## بۆ کۆچی دوایی مامۆستاو زانای کورد
## عەلائەدین سجادی

هوشیار حسین ـ سلێمانی

کە دل لەناکاو، گڕی دێتە یاد..
شڵپەی شەپۆلی
دەریا سست بووە،
ڕەشەبای تووڕە، ئەوەندەی خەم خوارد
مات و کز بووە..
مانگ مات و خامۆش
ئاسمانیش پەستە،
پێنووس تۆراوی خامەی هەڵبەستە..
دڵ بێ ئۆقرەیەو، ئارام نەماوە
یا شاگوڵێکی باخ هەڵوەریوە،
یا هەوری پاییز،
ئەستێرەیەکی لەمانگ دزیوە،
یا ئەدیبێکی زاناو ڕابەرە،
بۆ هەتا هەتا، چاوی لێك ناوە؟!

★ ★ ★

(فورات) بەهەورا، هەواڵ بنێرە،
تاکو بزانین
لە حەیدەرخانە،
(سجادی) سەری بە کتێبێکدا شۆڕکردۆتەوە،
یان ئەستێرەکەی ژیان و تەمەنی
ڕژاوەو ئێستا،

بۆ ئامێزی خاك ئەگەڕێتەوە...

● وا هەوری هەواڵ

بە بێ وەرامە،

دیارە وەك ئێمە دڵی پڕ زامە..

+ پاییز تۆ کارت گەڵاڕێزانە

کەی گیان کێشانە..

وا بۆ کۆچێکی گەورەو ناوەخت، وشە دێتەگۆ :

«رشتەی مرواری‌و مێژوونووسمان ڕۆ..

چرای رۆشنی کوردستانمان ڕۆ..»

دەسا ئەی زانا، ئەی پایە بڵند..

پێنووس کانی زێڕ..

شەرتە تا مێژوو، ڕەوڕەوەی بڕوات..

ناوو کردارت،

لەناو دڵمانا،

کۆچ نەکاو، نەڕوات..

(العراق)

١٩٨٥/٥/٢٢

# دوو دڵۆپ فرمێسك

# بەسەر گۆڕەکەی مامۆستا سەجادیدا

● ئیسماعیل ئیبراهیم ●

مامۆستا خزمەتگوزارەکەم!

وا ساڵێکی خشت بەسەر لە بەرچاو گوم بوونتا تێپەڕی، بەڵام وێنەت هەر لە بەرچاومانەو، یادت لە دڵ و دەروونمانا.

ئێستا هەر ئەوەمان بۆ ماوەتەوە یادت بکەینەوە، هەناسە هەڵکێشین و بڵێین ڕەحمەت لە گۆڕەکەت و جێت بەهەشتی بەرین بێ.

ئیتر، مامۆستا گیان، کەسی‌تر ناتبینێ ئاغر ئاغر بەسەر جادەدا بڕۆی...

کەس لە ژوورەکەی مزگەوتەکەتا بەدیت ناکا. کەس لە ژووری میوانی ماڵەکەتانا ناتبینێتەوە.. بەڵام یادی مەجلیسە خۆشەکەت هەرگیز لە یاد ناچێ کە ئەهاتینە خزمەتت، پاش هەواڵ پرسی و بەخێرهاتن، دەست ئەبرد بۆ دەوری‌یە پانەکەی توونە گەڵا زەردەکەی کوردستان و پەڕە سیغارێکت لەولاوە هەڵ ئەگرت و ئەتپێچایەوەو ئەتکرد بە دار سیغارە بڵاڵووکەکەوەو مژێکت لێ ئەدا‌و، یەکە یەکە لێت ئەپرسین:

«ئەرێ، کوڕە، تۆ لەچی‌یای؟»و قەف قەف دووکەڵی سیغارت ئەکرد بەئاسماناو نوکتەی خۆشت ئەگێڕایەوەو نوکتەی خۆشت پێ ئەگێڕاینەوە. جا لەدوای هەر قسەیەکەوە ئەتفەرموو: «ئیتر بزانین خوا چی ئەکا!»

مامۆستا گیان!

هەروەك تۆ ئاوا ئاگرت بەرئەدایە جگەرەکەی دەستت، بە کۆچ کردنیشت ئاگرت بەردایە دڵ و دەروونی هەزاران کوردی ئەدەب دۆست.. بۆیە کە هەر کسپەی یادی تۆ ئەدا لە جگەرمان، ئەبێ دەس بۆ یەکێ لە بەرهەمە بەپێزەکانت درێژ بکەین و، کەمێك سەبووری بەدڵمانا بهێنین، کە هەر کتێبێکت مامۆستا عەلادینێکە لە جێت بەجێ‌ماوە

مامۆستا گیان! یادت بەخێربێ‌و، یادت لەدەروونمانا وەك چیا بەرزەكانی کوردستان جێگیرەو هەرگیز لاناچێ‌و.. دیسانەوە ماڵاوا!

**هاوكاری ١٩٨٥/١٢/٢٦**

# بەبۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەرکۆچي شاسواری جولانەوەی ڕۆشنبیریی کورد مامۆستا علاءالدین سجادی‌دا

● غفور میرزا کریم ●

پار لە 13 لەسەر 14 ی مانگی کانونی یەکەمی ساڵی 1984 دا، دڵی گەورەی پڕ لە خوزگەو ئاواتی بەرزو ئامانجی پیرۆزی شاسواری جولانەوەی ڕۆشنبیریی کورد لە لێدان کەوت، مێشك و بیری بلیمەت و زاناو بەهرەوەرێکی چابوك سواری ڕێگای پێشکەوتنی کاروانی ڕۆشنبیری لە بیرکردنەوەو بەخشین ڕاوەستا.

ئەو خامە ڕەنگینەی، کە لەناو پەنجەی دەستی دا بێ ووچان ڕازو نیازی دڵسۆزی دوو توێی دڵی، داخی دەروونی، هەلالەو شیلەی بیری تیژی بێ گەردی کە مێژووی ڕۆشنبیریی کوردی بێ تۆمار دەکرد لەناکاو لەکار کەوت.

بەڕاستی هەر ڕۆشنبیرێ ئەگەر بە بەرهەمی زۆرو تێرو پرو پوختەو بەپێز، بە بەخشندیی بە چێژ و شاکارو برشت دارو سوود بەخش و دڵگیر، بە چۆنیەتی کار تێکردنی ووشەکانی بۆسەر بارو دۆخی کۆمەڵ و بۆپیشەوەچوونی کاروانی ڕۆشنبیری هەڵسەنگێندرێت و بنرخێندرێت، ئەوا بێ چەندوچوون مامۆستا علاءالدین لە ریزی جولانەوەی ڕۆشنبیری کوردی‌دا نازناوی شاسواری ڕۆشنبیری وەردەگرێت.

مامۆستا علاءالدین بە وێنەی هەر ڕۆشنبیریکی مەزن لە پێناوی گەشەسەندن و دەوڵەمەندکردنی زمان و وێژەو زیندوکردنەوەو بوژاندنەوەی کەلەپوری نەتەوایەتی لەکۆشش دا بووە، هەمیشە شەونخونی بەدیار لاپەڕە ،ێژوویە، یا ژیاندنەوەی شاعیرێکی گوم بووە وە کێشاوەو لەسەر ساغ کردنەوەی ژیانی ئەم ڕۆشنبیرو ئەو کەڵە پیاوی کورد لەبەر قوتیلکەی چرای مزگەوت شەوگاری زستانی گرتووە بە بەرەوە بۆ خزمەتی ڕۆشنبیریو پێشخستنی کاروانی نەوەستاوی، بە وێنەی مەلەوانێکی کارامە گەوهەرو .

پیـــرۆزەی لەبن دەریـای گوم بودا، دەدۆزیـەوەو هەڵی دەبـژاردو دەیهـونیـەوەو دەیکــردە ملوانکـە بەسـەر سنگی جولاَنـەوەی رۆشنبیـری کورددا، بە وێنـەی زانایێکی بێهاوتا کیومالّی بەناو هەردو دەشت و هەریزەجاری بازاڕی کزو کەساسی رۆشنبیریدا دەکرد، تا شاعیرێکی لەبیرەوەچوو کەلّە پیاوێکی گوم بوو، لاپەڕە مێژووییکی نەزانراوە زیندوو بکاتەوەو ببووژێنێتەوەو بیخاتە ناو گەنجینەی مێژووی کوردەوە..

بەم چەشنە مامۆستا علاءالدین خۆی گەیاندە لووتکەی بەرزی رۆشنبیریی کوردیو بوو بە مایەی شانازی نەتەوەکەیو جێگەی تایبەتی و گرنگی خۆی لەناو جوولاَنەوەی رۆشنبیریی کوردی‌دا، کردۆتەوە.

شاکاری کتێبەکانی کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)، بەرگەکانی کتێبی «رشتــەی مرواری» لەگــەڵ چەنــدان کتێب و نامیلکـەو نووسینی لە گۆڤـارو رۆژنـامـەکـانی کوردیـدا بەلّگـەی بەتین و لەبەر چاوە بۆ بلیمەتیو بەهرەوەری شاسواری رۆشنبیری کۆچ کردومان، کە رۆشنبیرانی ئەمرۆ دەتوانن مەشقی دەرس وەرگرتنی لەسەر بکەن و رەنجی پر بە پێزی بکەن بە توێشو بۆ شوێن پێ هەلّگرتنی تا رێچکەی هەورازی پێشکەوتن ببڕن و دەست لە مل هیوا بکەن..

بەرێوەبردنی کاروباری (گۆڤاری گەلاوێژ) بۆ ماوەی دە ساڵی رەبەق لەگەڵ دەرکردنی گۆڤاری (نزار) بە شاکارێکی گەورە لە رێرەوی کۆششی نەپچراوی مامـۆستـا علاءالـدین دا دەژمێـردرێ بە تایبەتی (گۆڤاری گەلاوێژ)، کەئەمرۆ هیچ رۆشنبیرێکی تازە کوورە ناتوانێ بۆکەلّك وەرگرتن لە هەموو مەیدانێکی رۆشنبیریدا دەست بەرداری بێ، یابیخاتە پشت گوێ، شەونخونی کێشانی لەگەڵ گۆڤاری گەلاوێژدا و دەرهێنانی بەو شێوە نایابە گرنگە بەتایبەتی لە رووی ناوەرۆکیـــەوە کە بووبـــوو بە جێگـــەی رەزامـەنـدی تێکـرا جولاَنـەوەی رۆشنبیری بە ئەرکێکی مەزن و فرمانێکی پیرۆز دادەنرێ، کە ئەمرۆ نرخی وەکــو ئەرشیفێکی گرنـگ و تایبــەتی بوگشت جولاَنـەوەی رۆشنبیـریی کورد دێتەبەرچاو، کە رۆشنبیران بۆ هەلّهێنجانی زانیاری و زانستی، پەنای بۆ دەبەن و سوودی لێوەردەگرن.

مامۆستا علاءالدین لە مەیدانی رۆشنبیری‌و نیشتمانی‌تردا هەر سەرکەوتوو، شاســوار بووە، دەوری بالآو لە بەرچاوو گرنگی وەکـو ئەستێـرە لە ئاسمـانی رێـرەوی کاروانی نەپچـراوی یانـەی سەرکـەوتنی کوردان دا دەدرەوشێتەوە ئەم یانەیەی کە دەزگاییکی رۆشنبیری بووە کە نزیکەی 33 سالْ (1930 - 1963) لە خزمەت کردن دا بووە، کە دەوری بالآی مامۆستا علاءالدین زیاتر لە کاتی بو ژانــدنـەوەی یانـەدا کە بە دیـاری کراوی رێکـەوتی سالْی 1943 گەرمـەی جەنگی دووەمی جیهانی دەکەوێ بە زەقی‌و روونی دەکەوێتە بەرچاو . کە دووبـارە ئەم تاقی کردنـەوەی ژیـانی رۆشنبیـری‌یـەی مامـۆستـا علاءالدین لە بواری هەڵسـورانـدنی کاروبـاری یانـەی سەرکـەوتن دا پێـویستە بکەوێتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی رۆشنبیرانی ئەمرۆ، تا نەوەی تازە کەڵك و سوود لەو تاقی کردنەوەیە وەگرن تا ببێتە مایەی سەرکەوتن و پیش کەوتنیان کە ئومێدەوارین ئەم ئەرکەش، بە پیرۆزی‌و سەرکەوتویی ئەنجام بدەن . .

لەم هەلوێستەدا بە باشم زانی ئەم ووتووێژە کە لەسەر یانەی سەرکەوتنەو لەپێش چەند سالێکدا لەگەڵ مامۆستای بەرێزدا کردومە بیکەم بە دیاری‌ییکی بچـووك بۆ یاد کردنـەوەی تێـەڕبـوونی سالْێ بەسـەر کۆچ کردنی شاسـواری کاروانی رۆشنبیریی کوردی‌دا . . کوردواتەنی، دیاری دەستی هەژارێ هەر مستێ هەرزنەوبەس . .

## وتو وێژێك لەگەڵ شاسواریکی رۆشنبیریی کوردی‌دا

لە رۆژی هەینی 1982/3/19 لەگەڵ ماموستای بەرێز علاءالدین سجادی لە مالْی خویدا وتووێژێکمان دەربارەی یانەی سەرکەوتن وچالاکیەکانی‌و دەوری ڕوشنبیریی کوردی لە پیکەوەنان و بەجێهێنانی ئەرکی ئەستۆیان بەرامبەر ئەم دەزگا روشنبێری‌یە کرد، کە لە ئەنجامدا ئەم چەند لاپەڕە زانینە ووردە باسە مێژووییەمان دەست گیر بوو، کە وا ئیمەش بە پوختەیی وچڕی تۆماری دەکەین و دەیخەینە بەرچاوی خوینەری بەڕیز . .

ڕوشنبیرانی کورد لە سالی 1930 بۆ هەل و دەرفەتێك دەگەڕان و چاوەڕوانی ڕۆژێکی گونجاویان دەکرد، کە بتوانن تێیدا بە چاوگەیەکی زانستی، دڕ بە

ئەوە زەنــگــی دواکــەوتــن و نەزانـــیـــن و بێ ئومـــیـــدی بدەن، بازاڕی کزوکــەســاسی جــوولاّنــەوەی ڕۆشنبیــریی کورد گەرم و گوڕو خۆش بکــەن وە کاروانی نەسرەوتی رۆشنبیریی کوردیی، برێ بۆ پیشەوە بەرن..

لە پێش گرتنی پەیمانی دیلییەتی لە حوزیرانی سالی 1930 دا بەر لە ڕاپەرینە گەورەکەی شەشی ڕەشی ئەیلولی سلێمانی ، دەزگای میری لەژێر پالەپەستۆی جوولاّنەوەی ڕۆشنبیریی کوردا ڕێگەی دا، کە ڕۆشنبیرانی کورد ڕێکخراوێك بەناوی یانەی سەرکەوتنی کوردانەوە بێننە کایەوە، (بویە) هەر لە سەرەتـای سالّی1930 یەوە ڕۆشنبیـرانی کورد بەپێی توانـاو ووزەی خۆیـان و بەگوێرەی بارودۆخی گونجاوی ئەو ڕۆژە هاتنە مەیدانی خەباتەوە بۆخزمەتی ڕۆشنبیـــریی کوردو ووشـــە گەلی ڕەســـەن و دلسـوزی کورد. بەم بۆنـەیـەوە کۆبـــوونـەوەییکی گەورەو ئاهـەنگێکی بە جۆش.. بە بەشـداربـوونی سەدان ڕۆشنبیری کورد لە بەغدا لە سینەمای (ڕۆیالّ) سازکرا. لەو ئاهەنگەدا بانگی دامـەزرانـدنی دەزگـای یانـەی سەرکـەو تنیـان بە گوێی گەلدا دا. ئامادەبونی خۆیان بۆبەرەوپیش بردنی کاروانی نەوەستاوی ڕۆشنبیریی کورد پیشان داو داوایان لە تیکرای خوینەواران و کۆمەلاّنی خەلّك کرد بۆ یارمەتی دان و پشت گرتن. لەو ڕۆژەوە ئینگلیز پێی لە وولاتمان توندکردو چنگی چەوساندنەوەی خوێناویی لە لەش و دلّی گەلەکەمان ئالاند، هەمیشە بە پوازی دووبەرەکی دیوارو شورەی یەکیتی و پتەوی گەلی، تیك دەدا. بە موشەدەمەی ناکۆکیو برا لە برا کردن.. ئاگری ئاژاوەو شەڕی براکوژی خوش دەکرد، وە بۆپوچ کردنەوەی هەموو تەقەللایێك و هەلّوەشاندنەوەی هەموو پردێکی برایەتی نێوان ڕۆشنبیرانی عیراق بە گشتی و ڕۆشنبیرانی کورد بە تایبەتی لە کنەکردن و تەقەللادابوو..

لە نەخشەو پیلان نانەوە، لە تەگەرە دانان، لە کەندو کۆسپ دروست کردن بۆتێکدانی کاروانی روشنبیریی کوردیو سەرلێ شێواندنی هیچ ساتێك نەوەستاوەو سستی نەنواندوە.

ئینگلیزەکان لە سی یەکاندا ـ بۆبەستنی پەیمانی دیلیەتی لە سالّی 1930 لە پشت پەردەوە کاریـان دەکـرد، لە پێناوی یەك نەگـرتنی هێـزی بەربـەرەکانی عیـراقی دژ بە پەیمـانی دیلیـەتی تی دەکـۆشـان و، وایـان پێشـان دەدا، کە

دوبەرەکی سەرەکی لە نێوان کوردو عەرەب دایەنەك لە نێوان گەلی عیراق بە گشتی و ئینگلیزدا. بەندو باوی ـ ای بڵاودەکردەوە، کە گوایە هەر بەڵاو کێشەو سەرگەردانی یێك بەر عەرەب دەکەوێ لەسەر ئەستوی کوردە، هەرپێشێل کردن و مافی نەتەوایەتی و بەش خوراوی یەکێش توشی کورد دەبێ ئۆبالی دەکەوێتە سەر عەرەب.

بۆیە بڵاویان دەکردەوە کە گوایا تاوانی نەبوونی مافە رەواکانی کورد لە پەیمانی دیلیەتی ساڵی 1930 دا، کە تەنانەت کۆمەڵی نەتەوەکان ـ عصبة الامم ـ بڕیاری لەسەرداوە بۆ عەرەب دەگەڕێتەوەو بەریتانیا لەم رووەوە بێ تاوانە.

لەم بارو دۆخە ناهەموارەدا بوو، کەدەرفەتێك بۆ بەرەی رۆشنبیرانی کورد رەخساو بانگی دامەزراندنی یانەی سەرکەوتنیان راهیشت، وە بە بیرو میشك بە ووتاری دڵسۆز بە خامەی رەنگین بەربونە ویزەی لەشکری دوواکەوتن و نەزانین و بو خزمەت کردنی جووڵانەوەی رۆشنبیری، چاکی مەردانەیان هەڵکرد بۆ بەرزکردنەوەی کۆشك و تەلاری رۆشنبیری و کەوتنە چالاکی نواندن بۆخەبات کردن.

بەراستی دامەزراندنی یانەی سەرکەوتن لە بەغدا موژدەی سەرکەوتن و پیش کەوتن و ئومێد بەخشی دابەکورد وە بوو بە بنکەیێك بۆ کۆکردنەوەو رێکخستنی جووڵانەوەی رۆشنبیری وە گەشە سەندن وپەرەپێدانی ووشەو زمانی کوردی و بوژاندنەوەو زیندوکردنەوەی مێژووی کوردی و ناسینی بە گەلی کوردو بە جیهان.

باس و خواستی یانەی سەرکەوتن لە بەغدا دەنگیکی گەورەی لە ناو رۆشنبیرانی کورد، دایەوە بە تایبەتی لیژنەی بەرێوەبەری لەو سەردەمەدا لە زاناترین و دڵسۆزترین و ناودارترین رۆشنبیرانی کورد پێك هاتبووکە ئەمەش لەگرنگی و دەوری زیاتر دەکات و ناوی لەبەرچاو خوێندەوارانی کورد زیاتر بەرزترو خوشەویست تر دەکات.

لێرەدا مامۆستا پرسیاریکی گچکە دێتە گۆرێ:

نازانم بۆچ روشنبیرانی کورد لە دەزگای یانەدا هەڵویستی گۆشەگیریان بەرامبەر رووداوەکانی عیراق وەردەگرت؟
یاخود بۆچی بە باشی تێکوشانی خویان گرێنەدەدا لەگەڵ تیکرای هێزە بەربەرەکانیەکانی عیراق دا دژی ئینگلیز، کە ئەمە رێگەی راست و ڕەوان بوو، بۆ بەگژاچوون لەگەڵ دژمن داو سەندنەوەی مافی رەوای گەل؟
ووتمان رێگەو ماوە بۆ کردنەوەی یانە بە دەرەفەتیکی پچووك بۆ روشنبیرانی کورد دادەنرێ کە تیایدا ناتوانن بەگوێرەی پێویستی گەل و بە ئارەزووی خۆیان ئەسپی لێ تاوبدەن و لەو سنوورەی کە دەزگای میری بۆی داناوون تێپەرن و زیاد رووئی بکەن، هەروەها لە سەرێکی تریشەوە جوولانەوەی کوردیش لەو توانـــاو دەستـــەلاتـــداریـــەدا نەبـــوو، کە هەل و مەرجی خۆی بســـەپێنێ بەســـەر دوژمندا، واتە پێویست بوو بەپێی بەرەی خۆی هەنگاوبنێ. بە کورتی بارو دۆخی ئەو رۆژە لەوەندە زیاتری بۆ روشنبیرانی کورد، دابین نەکردبوو یان نەرەخساندبوو. جگە لەمە دەزگای ئینگلیز بە بەراووردکردن لەگەڵ دەستەلاتی هێزی جوولانەوەی نیشمانی لە پایەیێکی بەرزی بە توانادا بوو، بە رەنگێ کە لە نەخشـــەو پیـــلانـــەکـــانی لە هەمـــوو روویـــەکـــەوە بە ئاســـانی بەســـەر هیـــزی نیشتمانیدا دەرۆی..
هەر ئەم هۆیـــەش بوو، کە جوولانـــەوەی رۆشـــنـــبـــیـــریـــی کوردی خستبـــوە چوارچێـــوەیێکی کزو لاوازو بێتـــوانـــاییـــەوە کە نەیدەتـــوانی تەنانەت هاوبەشی خۆی لەگەڵ رۆڵەکانی شەشی رەشی ئەیلول دا بنوینێو برایەتیو یەکیەتی تێکـــوشـــانی بۆ ئەم جوولانـــەوە شورشگێـــرێیـــە دەرببرێت، بە پێچـــەوانـــەوە پچرپچربوونی جوولانەوەی نیشتمانی کاریکی ناهەمواری وای پێك هینابوو تەنانەت شیخی گەورەش (شیخ محمودی نەمر) بێئاگا بوو لەم راپەرینە کە بەچەشنێ پاش روودانی بە عەشقی ئاگری تولەسەندنی لە (پیرانەوە) بە هیـــوای سەنـــدنی خوێنی ( عەولە سیس) بۆ مافی رەوای کورد جاریکیتـــر هاتەوە مەیدانی خەباتەوەو شەری (ئاوباریکی) دژی میریو ئینگلیز هەڵگیرسانەوە.

بەداخەوە رۆشنبیرانی کورد ەو رۆژەدا بە هێزو تواناو هوشیاری لە پایەو پلەییکی وادا نەبوون کە بە بیرو باوەڕ، یا بە هەرشێوەییکی رەخساو پشتی راپەرینەکەی بەردەرگای سەرا بگرن و بە ئەرکی پێویستیان بەرامبەری بجولێنەوە.

پاش ئەوەی بریار بە کردنەوەی یانە دەرچوو دەستوبرد باوەڕ پێکراوی گشتی مارف جیاوك ماڵەکەی خۆی لە گەرەکی صابونچی لە بەغدا کرد بە بارەگەی یانە بۆ کۆبونەوەو گفتوگۆ، چاو پیکەوتن، پێ ناسین و بۆ بەرێوەبردنی گشت کاروباری یانەی تەرخان کرد.

یانەی سەرکەوتن لە ساڵەکانی (سی)دا بە گۆشەگیریو سستیو خاویو بێ دەنگی ژیـانی دەبـردە سەر. لەم ماوەیـەدا زۆر قەومـاوی نەتـەوەیی نیـشتـمـانی . . رووداوی گەورە لە وڵات دا هاتـە سەر شانـۆ کەچی بەداخەوە یانەی سەرکەوتن تیایا بەشدار نەبوو وە هیچ چەشنە دەورێکیچ لە رووی قسەو بیرورا دەبرین یا بەکردەوە پیشان نەداوە، دیارە دەزگای میری ریگـای چالاکي نوانـدنی بە یانـە نەداوەو جووڵانـەوەی رۆشنبیـری کوردییش ئەوەند بە هیزو توانا نەبووە کە سنووری دیاری کراوی خۆی بشکێنێو بانگی خۆی بەئاشکرا بداو بیرورای بسەپێنێ بەسەر رۆژگارداو ناوی خۆی دەرخات و لەســەر رووداوەکـانی وڵات بنـوسی. دوایی ساڵ هاتو ساڵ روویی شەڕی دووەمی جیهانیش لەلایەن ئەڵمانیای هتیلەریەوە هەڵگیرسا. بەم چەشنە گێتی بوو بە دوو بەشی سەرەکی دژ بە یەکتری بەرەی دیمکراتیەت لەگەڵ تێگرا گەلان دا کە لەپێناوی رزگـاریو سەربـەستی بەرامبـەر بەربـەست کردن و لەنـاوبـردنی ئەلمـانیـای نازیدا کەوتنـە خەبـاتیکی سەختی خوینـاویەوە لەناو جەرگەی جەنگ.

بە هەڵهاتنی ئاسۆی سەرکەوتن و زاڵ بوونی بەرەی گەلان تەرازووی هێزو باری جیهـانی کەوتـە گۆڕان و ستـەمی زۆرداریو چەوسـانـدنـەوە لە گرێژەنە دەرچوو، شنەی شەماڵی ئازادی دڵی تیکرا گەلانی فێنك دەکردەوەو ئازادی خوازانی جیهان لە خەوی بێئاگایی راست بونەوەو بۆ داواکردنی مافی رەوای گەلانیـان کەوتنـە چالاکی نوانـدن و تێ کوشـان. لەم بارو دۆخە تازەیـەدا

دەزگای میری کەوتە پاشەکشێ و لەژێر پاڵەپەستۆی جوولاّنەوەوی گەلان دا دەرگای ئازادیو دیمکراتیەت کرایەوەو نیشتمان پەروەران لە سەراسەری عێراقدا هاتنە مەیــدانی خەبــاتــەوە، بۆ مافی پێ شیــل کراوی گەل کەوتنـە خۆکوکردنەوەو ئامادەبوون و، بیروباوەڕ دەربرین و تێکوشان.

یانەی سەرکەوتن لە ساڵی 1943 دا بە ناوی دامەزرینەکۆنەکانیەوە لەسەرو هەموویانەوە باوەڕ پێ کراوی گشتی مارف جیاوك هاتنە کۆری مەیدانەوە، بۆپێك هینانی ئامانجەکانی جوولاّنەوەی رۆشنبیری بە گەرمیو گورجی کەوتنە خەباتەوە. شیاوی باسە لاوانی تازەپێ گەیشتو و قوتابیانی خوێن گەرمی قوتابخانە بەرزەکان وتێکرا خوێندەواران باوەڕیان بەشێوەی تێکوشانی کۆن نەما دۆست و دوژمنی گەل بە روونی دەرکەوتن، پشت بەستن بە هیزی گەل، تێکوشانی بێ ووچان دژی ئیستیعمارو دەرەبەگ و کۆنەپەرست، بوو بە باوو بۆیە هێزی تازەی گەل بە نوێنەرانی کۆنی یانەی سەرکەوتن رازی نەدەبوون، داوای گۆڕینیان دەکردو خواستی هێنانی نوێنەری تازەیان دەکردو بوگۆرین و هەلبـژاردنی لیـژنـەی بەرێـوەبـەر کەوتنە جموجوولّ. وابزانم ساڵی 1944 کە لەلایەن لیژنەی بەریوەبەری یانەوە بریارێ دەرچوو کە لە بارەگا لە گەڕەکی عەلوازیە پێویستە تێکرا ئەندامانی یانە بۆ هەلبژاردنی لیژنەی تازە ئامادەبن، بەم چەشنە وەکو مامۆستا دەلێت:

هەرچی دەستی قەڵەمی دەگرت، چاوی بە کلچێوکی خوێندەواری رشتبوو، سەرەواوێکی دلسۆزی زانینی لە مێشك دا بوو، ئەو رۆژە لە بارەگەی یانەدا کۆبـووەوە، واتـە ئەگـەر دەرزیت هەڵبـدایـە نەدەکـەوتـەسـەر زەوی.ئیتـر تیکـرا رۆشنبیرو خوێندەواری کورد لە بەغدا لەیانەدا کۆبونەوە بۆ هەلبژاردنی لیژنەی بە ریوەبەری تازە.. هیچ سوێندتان لەسەرم نیە، ئەگەر باوەڕیش ناکەن، زۆرم لەسەرتان نیە. ئاگام لەوە نە بووە کەروشنبیرانی کورد من و ماموستا ئەمین زەکی بەگیان، خستبوە لیستەی هەلبژاردنی خۆیانەوە. بەراستی ئەم رۆژە رۆژێکی میـژوویی دیـاربـوو کە هەرگیـزاو هەرگیـز لەبیرم ناچیتەوە نەك چونکە ئەوی لاوو قوتابیانەو رۆشنبیرانە منیان هەلبژاردو بەس بەلکو دیمەنی ئەو کۆمـەلاّنی روشنبیـرەی کە بە ئازادیو دیمکــراتیــانـە هاتبـوونـە کۆڕی

هەلبـژاردنـەوە بە تونـدی دڵ ومێشکی دەهـەژانـدو خوزگـە خوازیم دەکرد کە کۆمـەڵانی خەڵکی بەم چەشنـە مەشقیـان دەکـردو بەم دڵ وگیـان ئازادیو دیمکراتیەوە دەچوونە کۆڕی هەڵبژاردنەوە بۆ تێکرا دەزگاکانی میری تا گەل خۆی بۆ خۆی فەرمانرەوایی بنوێنی، تا چاکەو باشە لە هەموو مەیدانیکدا چەکەرە بکات و چەوتی و خراپەش تۆوی بم کوڵەکەی ئاش دا بچێ. بەڵام بەداخـەوە ئاواتـەکـەم نەهـاتـەدی، خۆمـان نەمان توانی لەم تاقی کردنەوەیەدا سەرکەوتن بەدی بهێنین و ئەم هەڵبژاردنە بە دروستی بەرین بەڕێوە، نەمان توانیئەوانەی کە خۆمان دەمانەوێ هەڵیانبژێرین و بیان خەینەسەر دەزگای کار تا بۆپیشـەوە چوونی کاروانی رۆشنبیـری هەمـوولـە چالاکیـا بین. دیـارە دیمکراتیەت هەر قسەی رووت نیە. زۆری ئەویت؟، کەمرۆڤ یاگەل فێربێو مەشقی لە سەر بکا تا بە کردەوە دیمکراتیەت بەجێ دەهینیو لیێ لانەدات.

بە داخـەوە لە هەڵبـژاردنـەکـەدا دەستـەی کۆن بردیـەوە لە جیـاتی ئەوەی ئارەزووی لاوان و قوتابیانی تازە پیگەیشتوو ئاواتی رەوای کۆمەڵانی رۆشنبیری جیگیـربێو سەرکـەوێ، بەپێچـەوانـەوە بەرێـوەبەرانی پێشوو، شێوەی کۆن لە تێکوشاندا، پیاوانی رۆشنبیری نەگونجاو لەگەڵ بارودۆخی تازەی وڵات و جیهان دا هاتنەوە سەرکار، لەئەنجام دا پاداشتی بەشداریم لەم هەڵبژاردنەدا، کەپشتگیـری لاوان بووم خستیـانمـەپـاڵ دەستـەی لاوان و قوتابیان و بە ناوی ئەوانـەوە دەستـەی دەزگـای میـری منیشیـان لەگـەڵ ئەو دەستـەیـەدا راپێچی بەندیخانەکرد کە بە هەزار حاڵ و تکاکردن ئەوسا بەرەڵلا بووین بە تایبەتی ئەوانەی کە لەگەڵم دا گیرابوون هەریەکەیان لە بنەماڵەیەکی ناسراو بوو هەر منی تیـابـووم لە ناویـانـدا کە بێ کەس و بێ پشت وپەنا بێت، بۆوینـە لە بنەماڵەی قەزاز، عبد القادر قەزاز، لە بنەماڵەی سید ئەحمەدیخانقاە، کاکە حەمـەی سیـد. لە بنـەمـالـەی تاڵەبانی، مکرم تاڵەباني. لە بنەماڵەی دزەیی جوهـر کانـەبی، لەگـەڵ جلیـل یوسف ومـامـوستـا علاءالدین. شیاوی باسە هەرچەندە رۆشنبیرانی کورد تیکرا ئامانج و ئاواتی بەرزیان خزمەت کردن و پێش خستنی کاروانی رۆشنبیری بوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا نابێت ئەوە لە بیـرکـەین، کە بەرژەوەنـدی چینـایـەتی بێ، یا تاکە کەسی جیای دەکردنەوە،

بۆیە ناکۆکی لەنێوان ئەم رۆشنبیرو ئەو رۆشنبیر، ئەم دەستەو ئەو دەستەیەدا هەبوو ئەمیان پلارو توانجی دەگرتە ئەو لا، یا ئەو دەستەیە ئەمی تری بە گوناهی گەورە تاوانبار دەکرد کە لە ئەنجامدا دەرکەوت، پاش چەندان ساڵ و گۆڕانی زۆر قوناغ و پلە کە ئەو گوناهانەی دەخرانەپاڵ ئەم و ئەو زۆری راست نەبوو، بەڵکو زۆربەی زۆری رۆشنبیران ئەگەر هەموو نەڵێین کوردایەتی پاك و بی گەردو خزمەت کردنی خاك و نەتەوە لە کانگای دڵیان دا قوڵپی دەداو لەم پیناوەدا هەموو رێگەو شێوە تێکوشانێکیان دەکرد.

دوا قسەم مارف جیاووك کە لە ماوەیێکی زۆردا باوەرِیێ کراوی گشتی یانە بوو، رۆشنبیریکی کوردی ئازابوو لە پیناوی مافی رەوای کورددا، لەگەڵ هاواڵەکانی تری هیچ دریغیەکیان نەکردوە چەند لە توانایاندا هەبوویێ لەم مەیدانەدا پێش کەشیان کردوە. ئیتر مارف جیاووك نوینەر بوویێ یا متصەرفی سلیمانی یا باوەریێ کراوی گشتی یانەی سەرکەتن بوویێت لە هەموو حالەتیکدا لە خزمەت کردنی وڵات و رۆشنبیری کوردی کەمتەرخەمی نەکردوە.

ئەگەر وەکو ماموستا علاءالدین دەڵێت ئەگەرچەند جاریکیش لەسەر کوردایەتی و کێشەی رۆشنبیری مشتومریشمان بوویێ بەڵام دوایی خۆی ئاشتی کردومەتەوەو ئاو کراوە بە ئاگرداو لە ریزی جووڵانەوەی روشنبیران دا دەرنەچووە.

لە دوایی دا ئومێدەوارم جووڵانەوەی رۆشنبیری ئەمرۆ کەلك و سوود لە رابووردووی رۆشنبیرانی کۆن وەربگرن و ئیستایان لەسەر تاقی کردنەوەی کۆن دابنێن تا کاروانی رۆشنبیریمان کاژی کۆنی بێ کەڵك و بێ فەر فری بدات و لە هەمان کاندا کەڵك لە رابوردووی پرشنگداری سوودبەخش ببینی تا بەرەو ئامانجی گەورەی رۆشنبیری برۆین. کوردواتەنی هەر عەقڵەو بیرە لە خەساری، تا نەدەی رەنج ناگەیت بە گەنج.

**رۆشنبیری نوێ، ژمارە ۱۰۸، ۱۹۸۵**

# «سەجادی» لە ئامێزی فرمێسك وئاگردا

● «قوبادي جەلي زادە» ●

شەوی نەورۆزی 1985

هەتا دوێنێ لەڕاخی بێدەنگیدا
شاعیرێ بووم
بەتەوژمی گردە شەپۆلی سەرشێتی
هیچ دەریایێ
هەڵنەقەنام . .
کەچی ئەمشەو هۆرەی عیشقت،
بوو بەقەتاری قورینگی شەونخونیو
بۆسەر گۆڕی دوورە دەستت
هەڵپێچام . . . !

★ ★ ★

ئەی گەوهەری نێو حەشارگەو
کەڵەکە، بەرد
ئەمشەو لەباخەڵتا نرکەی،
شاعیرێکی بریندارم
هاتووم لەدەورت گەڕێم و
گەرمە شینت بۆ بگێرم
بگریم وەك ئەو دەروێشانەی
بەسەر مەزاری حسێن دا،
بەلادادێن . . لەحەژمەتا
هاتووم ئارامگەی غەریبیت گوڵ باران کەم
بنوشتێمەوە بەسەریا وەکوو گومەز
باسکەکانم بکەم بە کێل .
ناوی یەکەم کەڵە سەربازی نەمری،

لێ هەڵکەنم..
بە زمان، بە لێو، بە دوویاڵم
گەردی خەفەت،
لەسەر سینگی جەوهەردارت
رابماڵم..

★ ★ ★

هۆ سەججادی..
هۆ رێبوارە هێمنەکەی،
کاروانی رێی شەوو هەتاو
سەرهەڵبرە.
ئەمشەو ژوانی لوتکەو گڕە.
سەرهەڵبرە.
ئەو شۆڕەسوارە دایساوە، پیرەمێردەو
لەگەڵ کەوتنی تروسکەی زەردەپەڕا،
بەهەورازی گردی یارە هەڵدەزنێ..
سەر هەڵبرە..
ئەمشەو هەور بەهمەنی‌یەو
بەفر سوورە.
ئەمشەو وڵاتی شاعیران،
بابەگوڕگوڕی عیشقێکی بێ سنوورە..
ئەوە حەزرەتی نالی‌یە
لە ژوور سەرتا بەکوڵ دەگری
ئەوە دوو باڵی حاجی‌یە
لەگەردنی کێلی ئارامگەی غەریبیت
نابێتەوە..
ئەوە خانی دڵ بەخەمە

هەروەکوو مۆم بەدیارتەوە (گڵپە دەکاو)
داستانێکی نوێ دەنووسێ
سەرهەڵبڕە..
ئەوە «ژین» و «گەلاوێژ»ن
پرچ دروێنە دەکەن و
رەوسەی شین و
سەردولکەت بۆ هەڵدەڕێژن

★ ★ ★

دەستێکم چەپکە نێرگزەو
دەستێکم گڕ
هاتووم ئەمشەو لەچووزەرەی شیعری گڕدا،
ئاڵای سەوزت بۆ هەڵبکەم
ئەمشەو لەنێو گڕو گڵپەی..
مەشخەڵانی کۆی دەروونتا،
بەتاسووخی نەورۆز دەکەم
جێت ناهێڵم..
تا خاك وخۆڵی گۆڕەکەت
وەك وەکاشەو ئەبابەیلێ،
بۆ نەوەی نوێی نەزرگرتوو،
پیرۆز نەکەم

★ ★ ★

هۆ سەجادی..
ئەمشەو شاعیر، رشتەی مرواری فرمێسکەو
بەگەردنی گڵکۆتەوە،
خەناوکەیەکی نامۆیە.
ئەمشەو نەورۆز.. بێ بۆنی کەواو سەڵتەکەت.

ئازارێکی نابەڵەدەو
کزەی جەرگێکی بۆسۆیە.

ئەمشەوبێ تۆ
چیا دەگری
ئاگر دەگری
نەورۆز دەگری.

بەیان، کانوونی یەکەمی ١٩٨٥

# العلامة السجادي:
# وخدمات جليلة في مجال الاملاء الكردي

● مصطفى نريمان ●

في ندوة الاملاء الكردي التي عقدت على بهو المجمع العلمي العراقي مؤخرا حيا المجتمعون ذكرى وفاة الاديب واللغوي الكردي الراحل علاء الدين السجادي حيث وقف المشاركون دقيقتين احياء لذكرى اللغويين الذين اسدوا خدمات جليلة في مجال الاملاء الكردي وأثروا الموضوع بما عندهم من معلومات قيمة وهؤلاء هم (توفيق وهبي، علاء الدين السجادي، طاهر صادق، صادق بهاء الدين، ابو زيد مصطفى السندي) الذين كرسوا جانبا مهما من مؤلفاتهم وكتاباتهم في حقل اللغة الكردية لتوحيد املائها بالاحرف العربية. ومن الجدير بالذكر ان الراحلين الثلاثة الاخيرين قدموا بحوثهم المعدة للندوة المرتقبة، ومن الصدف ايضا ان العلامة السجادي توفي في نفس الاسبوع من العام المنصرم من توقيت الندوة لهذه السنة فالذكرى اتت وكأنها موافقة ومنسجمة مع وفاة احد اركان اللغة فالشيء بالشيء يذكر.

لم يكن علاء الدين نجم الدين السجادي (١٩٠٧ ـ ١٩٨٤) علما من اعلام الادب الكردي فحسب بل كان من اوائل المهتمين بجمع التراث الكردي والادب الشعبي (الفولكلور) ومن الصحفيين البارعين في مهنتهم فمجلة (گەلاویژ) الكردية ١٩٣٩ ـ ١٩٤٩ ومجلة نزار العربية ـ الكردية شاهدتان على طول باع المرحوم السجادي في مجال الصحافة. اما كتاباته الادبية سواء في الكتب او الدوريات فلها نكهة خاصة واسلوب متميز لم يضاهه فيه احد، ومما زاده صيتا ترفعه عن مقابلة الاساءة بالاساءة وتمسكه بالخلق الرفيع والنقاش الهادىء والوفاء والوقار وليس من قبيل الصدفة او الغرابة اذن ان ترثيه جميع صحفنا ودورياتنا اكثر من مرة فكان لجريدة (العراق) الغراء اليد الطولى في تكريس العديد من اعدادها لنشر ماترد اليها من كتابات الادباء في رثاء الاديب واللغوي السجادي واليكم ثبت ببليوغرافي بما اسهمت فيها هذه الجريدة فقط في هذا الميدان نظمناها حسب تسلسل نشرها الزمني:

١ـ السجادي افل نجمه فأخلده ادبه لكاتب هذه السطور. في الشهر الذي توفي فيه المرحوم (كانون الاول ١٩٨٤).
٢ـ الصمت البليغ للدكتور احسان فؤاد. في نفس الايام أيضا.
٣ـ عزاء للادب والتراث الكردي ـ للسيد لطيف مجيد گلي ـ في نفس الايام ايضا.
٤ـ الرجل الذكرى. للدكتور كامل البصير ـ في نفس الشهر.
٥ـ الى السجادي نفحات حب ونسائم وفاء ـ للسيد حسن الجاف ـ في ١٩٨٥/١/١٤.
٦ـ السجادي خلد الشعراء والشعراء عنه صامتون ـ كاتب هذه السطور في ١٩٨٥/٢/٢٥.
٧ـ في خضم وفاة الاستاذ الخالد علاء الدين السجادي (للسيد كمال غمبار باللغة الكردية) في ١٩٨٥/٤/٣.
٨ـ في ذكرى وفاة الاستاذ علاء الدين السجادي للدكتور حسن الجاف باللغة الكردية.
٩ـ مقالة مستفيضة عن المرحوم السجادي للاستاذ مسعود محمد عنوانه (تحاور الخواطر في غمرات موت السجادي).

هذا وقد أقيم حفل تأبيني لاربعينية المرحوم على قاعة جمعية الثقافة الكردية يوم ١٩٨٥/٢/١٤ اسهم فيه كل من (الدكتور عز الدين مصطفى رسول، الدكتور احسان فؤاد، الدكتور محمد شريف، الدكتورة شكرية رسول، الشيخ محمد الباليساني، الشيخ جلال الحنفي، الاستاذ جمال بابان، الاستاذ محمد جميل الروزبياني، الدكتور معروف خزندار برسالة من الجزائر، صاحب هذه الاسطر، عبد الرحمن المفتي، عبد اللطيف مجيد گلي، ممتاز الحيدري) تطرق كل واحد الى جانب من مآثر المرحوم السجادي وخدماته الثقافية والأدبية.

اما مؤلفات السجادي فنؤطرها في المحاور التالية:

١٥٥٠ صفحة (ثمانية اجزاء من كتاب رشتەی مرواری ـ عقد اللؤلؤ) في الفترة ١٩٥٧ ـ ١٩٨٣

١٣٤٠ صفحة ـ طبعتان لتاريخ الادب الكردي تم طبعهما في عامي ١٩٥٢ و١٩٧١

٤٢٠ صفحة ـ كتابان في النقد والبلاغة

٢٤٠ صفحة ـ كتاب لغوي واحد

٤٠٤ صفحة ـ كتابٌ (كوردواري) حول الادب الشعبي ـ الفولكلور ـ

٨٧٤ صفحة ـ اربعة كتب أدبية منوعة (دراسات ادبية)

٥٣٨ صفحة ـ ثلاثة كتب تاريخية واجتماعية عامة

٥٣٦٦ صفحة في (٢١) كتاب وبذا يحتل المرحوم السجادي المرتبة الثانية في وفرة الانتاج الفكري الكردي بعد العلامة الشيخ عبد الكريم المدرس اطال آلله عمره.

ومن المفيد ان نذكر ان المرحوم خلف ثلاث مسودات لكتب جاهزة للطبع وهي:

(١) الجزء التاسع من (رشتەی مرواری ـ عقد اللؤلؤ)

(٢) تاريخ النشر الكردي ـ واهمية هذه المخطوطة لاتقل عن اهمية تاريخ الادب الكردي الذي طبعه المرحوم مرتين وهي بحاجة الى طبعات اخرى

(٣) كتاب في علم الاحياء ـ مخطوطة جاهزة للطبع ايضا

وبهذه المناسبة نهيب بالدوائر الثقافية الكردية المعنية الاهتمام بالمخطوطات المذكورة والعمل على طبعها واعادة طبع الكتب التراثية والادبية للمرحوم السجادي، رحمك الله ايها السجادي فقد دخلت تاريخ الثقافة الكردية من اوسع ابوابها واثريت المكتبة الكردية بنتاجاتك الفكرية الرائعة فذكراك خالدة مادام في الكرد عرق ينبض.

**العراق/ ١١/ كانون الثاني ١٩٨٦**

# مەرگی سەججادی

● ئیبراهیم میرانی ●

ئێوارە دەرنگێکی رۆژی پێنج شەممە بوو، دنیا تاریک و ئاسمان پڕ لە هەوری چڵکن بوو، کزەی سەرماو بۆنی بارانێکی داهاتوو تێکەڵاو بووبوون. پوورم (دایکی دانا) - خێزانی خوالێخۆشبوو - لەگەڵ خێزانەکەی مندا تازە لە بازار گەڕابوونەوەو هەر یەکەیان تۆپێ قوماشی خامی سپییان بەدەستەوە بوو، وتیان مامۆستا رای سپاردبوون کەوا هەوڵی پەیدا کردنی بدەن، بێ ئاگا بوون لەوەی کە ئەو خامە بۆ کفنی بوو.

سەرنجم دا پوورم پەلەی بوو بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان، هەروەها منیش بە فرسەتم زانی بیبەمەوە بۆئەوەی چاوم بە مامۆستا بکەوێ، چونکە رۆژی پێشتر داوای لێ کردبووم کەوا سەری لێ بدەم بۆ ماوەی نیو سەعاتێک بۆ تەواو کردنی باسێکی تایبەتی. کەوتینەڕێ لە پاش دووسێ دەقیقە لە بەردەرگای ماڵەوە بووین، چەند دراوسێیەك بەتاو بەرەو ژوورەوە ئەچوون، ئێمەش بەدوایاندا، دەنگی زریکەی یەکێ لە کچەکان هات بەگوێماندا «باوکم مرد!».

لەم دەنگە داچڵەکێنترو نەفریناویتر دەنگە نەبوو بۆ گوێی پیاو، چونکە پەیامی کارەساتێکی زۆر قورس بوو ئەوەی ئەگەیاند. جگە لەوەی کە سەججادی وەکو مرۆڤێکی زۆر خۆشەویست ئاوا بوو، رووبارێکی زانستیو رۆشنبیری مەزن وبێ هاوتایش وشك بوو

لەگەڵ خۆمدا وتم: ئایا رەفتاری ئەم رۆژگارە ناهەموارە لە هەموو گەڕانێکدا بۆ هەموو کەس هەر شین پەروەرییە؟ یا ئەو هەورە چڵکنەی ناسۆر هەر بەسەر شاری خامۆشاندا دەسوورێتەوەو تك تك رەشاوو زووخاوی کوێرەووری دەرژێنێ بەسەر یەکەیەکەی خەڵکە کلسە هەزارەکەیداو وەك پەردەیەکی نووتەکی جیهانگیر ئەو دڵە کلۆڵەی لە بوخچەی ماتەمدا دەپێچێتەوە؟!

بەیانی ڕۆژی هەینی ١٩٨٤/١٢/١٤، تەرمە پیرۆزەکەی بەئێگجاری ماڵی بەجێهێشت و بەسەرشانی سەدان کەس لە بنەماڵەو دۆست ویارانی هەڵگیراو سپێردرا بە خاکی پیرۆزی گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی.

وەکو هەموو کۆچکردوویەکی تر سێ ڕۆژی ماتەم بەسەرچوو، دەستگا ڕۆشنبیریو زانستی یەکان کەوتنە جم وجوڵ کەوا لە چلەیدا یادی بکەنەوە. ئەوە بوو لە ١٩٨٥/٢/١٤ کۆڕێکی ڕۆشنبیریو ئەدەبی بۆ سازدراو دۆست و خۆشەویستانی داخ و پەژارەی پەنگ خواردووی دڵ و دەروونیان تیدا دەربڕی دەربارەی دواکۆچی ناکاوو تا هەتای گورچکبڕی ڕابەرێکی بیرو کولتوورو ئەدەبی کورد. وا ئەمڕۆش چەرخ سوورایەوەوساڵێك چووەسەرو ناوی مامۆستا زۆرتره لەسەر زار، ژمارەییکی زۆر زۆر لە دۆستان و خۆشەویستانی هەوڵ ئەدەن کەوا شەرەفی بەشداری یادکردنەوەی ساڵانەیان هەبێ بە هەموو شێوەیەك و بەجۆرێك لە ڕۆژنامەو گۆڤارو دەستگاکانی تری ڕاگەیاندن جێیان نابێتەوە.

کۆچی زانا سەججادی نەك هەر زیانێکی گەورەو شوێن پڕەوە نەبووی بنەماڵەو کەس وکارو دۆست و یارانی بوو، بەڵکو زیانێکی جەرگبڕو کاریگەر بوو بۆ ئەدەب و کولتوری کوردی و مەشخەڵێکی پرشنگدار کوژایەوە کە لە سییەکاندا گراو شەوە زەنگی نوتەکی کوردستانی ڕووناك کردەوەو ئاسۆیەکی پان و بەرینی ئاوەڵەگرد لە بەردەم گەلەکەیدا بۆ خەبات لە پێناوی ڕزگاریو دیموکراسیو پێشکەوتندا. سەیری لاپەڕەکانی گەلاوێژو (نزار) بکەن بزانن لەگەڵ هاوەڵە نەمرەکانیدا چ شۆڕشێکی بیریی و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازی دیموکراسی یان بەرپا کردووە لە ڕۆژێکدا کە کوردستان و عێراق لەژێر باری دەسەڵاتداری ئیمپریالیزم و نۆکەرانیدا دەیانناڵاند...، سەرنجی هەموو نووسینە ئەدەبی و کولتوری و مێژوویی یەکانی بدەن، تەنها خۆشەویستی و ئەمەکداری خاوێن و پەتیو ڕەسەنی خاك و نەتەوەکەی دەبینن و، لە هەموو ئەو دەورانەدا کە بەسەر عیراقدا تێپەڕین بە هەنگاوێکی نەگۆڕو ڕێبازێکی ڕاست و ڕەوان دەجما، بێ گوێدانە ئەو تەوژم و لنشاوەڕامالانەی کەدەهاتە

ڕێی گەیشتنی بە ئامــانجــە پیــرۆزەکــەی کە گەڕان بوو بە شوێن ڕاستیو چەسپانـدنیو بەرگـری لێ کـردنی بەوپـەڕی نەترسیو لە خۆبوردنەوەو بەپێی بەرنـامـەیێکی زانستیو لەبـار دەستی کرد بە گەڕان و لێکۆڵینـەوەی ڕابوردووو بەرهەمە نەمرەکانی بەری ئەو ڕەنج و تۆژینەوانە بوون. . . لەپێش هەموویانەوە کتێبە نەمرەکەی (مێژووی ئەدەبی کوردی) کە یەکەم کتێبە وردترین زانیاری تێـدابێ دەربـارەی شاعیـرو ئەدیبـانی کوردو کەلەپوورە شارراوەکانی ئەدەب و ڕۆشنبیـری کوردی بە پینووسێکی جوانکـارو هونـەرمـەنـدانە خستەڕووو بووە سەرچاوەیێکی ئەوتۆ کە پشتی پێ دەبەستن لە لێکۆڵینەوە مێژوویيو ئەدەبی یەکانیاندا.

هەروەهـا زنجیـرە تۆژینـەوەکـەی دەربـارەی هەشت بەرگـە چاپکـراوەکـەی (ڕشتــەی مرواری) کە بە شێــوازێکی وەستــایــانـەی خۆش و هەنـدێ جار گاڵتەوگەپ ئەو چیرۆك و قسە نەستەق و دەماخ چاخکەرانەی کە لە ئاسۆی خەیــاڵێکی کوردی پەتیـەوە گزنگیـان دابـوو بڵاوکـردەوەو لە لەنـاوچـوون و بیرچوونەوە پاراستنیو گیانی نەمری کردنەوە بەبەردا.

ئێمـە بنـەمـاڵـەو کەس وکـاری سەججـادی، تەنـانـەت لە ژیانی ئاسایی ڕۆژانــەشی لەنـاومـانـدا تەنهـا لە خۆبـوردن و هەتـەریودڵسـۆزیو پەرۆشی تۆژینەوەو نووسین و خواناسیمان لێ بەدی دەکرد، هەر بەیانیان زوو چاوی ئەکردەوە تا نیوەشەوێکی درەنگ خەو دەیهێنا بە لادا دەقیقەیەکی کاتەکەی بەفیـرۆ نەدەداو زۆربـەی کاتی لە کتێبخـانـە ئاوەدانـەکـەیـدا بەسەر دەبردو بۆ نانخــواردن یان ئیشێکی پێــویست و پێشــوازی میــوانێـك نەبوایـە بەجێی نەدەهێشت، لە هەموو ژیانیدا ڕێك وپێك بوو لە سەرەتاوە تا کۆتا بەرنامەی بۆ هەموو گەورەوبچووکێکی ژیانی دانابوو و بە ووردی پێرەوی دەکرد. . . ، بێ فیزو ساکار بوو لە خواردن و پۆشین و گوفتارو ڕەفتاریدا، تەنانەت بەدرێژی تەمـەنی نەخـۆشیـیـەکی وای نەگـرت لە جێگـادا بیخـات، تالـەناکاو چنگی ڕەشی مەرگ لەناوماندا ونی کردو ئەو دڵە بەهرەدارە پڕ لە جۆش و خۆشەویستی نەتەوەو نشتمانەی لە لێدان خست.

له کۆتاییدا هەزار سڵاو لە گیانی پاك و نەمری مامۆستاو هەموو ئەوانەی بۆ باوەڕو نەتەوەو نیشتمانەکەیان ئەژیر لەپێناویاندا ئەمرن.

**کاروان ژمارە ٤٠ کانوونی دووەمی ١٩٨٦**

## لمناسبة حلول الذكرى الاولى لرحيله:

# السجادي والتراث الكردي

● ابراهيم باجلان ●

عقب مرور عام واحد على رحيل فقيد الادب والثقافة الكردية الاستاذ علاء الدين السجادي الكاتب والقاص والصحفي والمؤرخ والشخصية الاجتماعية البارزة الذي ارتقى بجهوده المخلصة وكفاحه الدؤوب الى ذرى قمم المجد والفخر. ذلك لأنه سعى وناضل وبكل السبل الشرعية لتكون لشعبه مكانته اللائقة تحت الشمس، فاكتسب نظير اخلاصه وتفانيه حب واعجاب وتقدير ابناء شعبه وكل الذين عرفوه واطلعوا على نتاجاته.. واذا ما بحثنا عن الدوافع والاسباب التي دفعته الى سلوك هذا النهج في حياته نرى انها لاتخرج عن مدار دائرة حب الشعب وتراثه وترابه لاحبا للمال او الجاه، هذه الدوافع الخيرة التي لاتستهدف طمس دور أحد من الافراد او الشعوب ولا اغتصاب حق أحد.. وهي تشكل بمجموعها مفاتيح ابواب الخلود التي ولجها قبله الابطال والعظماء من العلماء والفنانين والادباء والمناضلين والمصلحين والنوابغ، مع وجود بذرة الابداع والموهبة في تكوينهم الشخصي والفطري. ولكل ما تقدم نحتفل بذكراه لانه كان ذلك الانسان الرائع الذي نعرفه من خلال اعماله ولهذا لسنا بحاجة الى الاشادة بذكره. ورغم ما قيل ويقال في حقه فان كل الاقوال، لاتبلغ القمة التي تسنم ذراها.. واذا ما اردنا ان نضيف شيئا فاننا لانضيف شيئا جديدا، لكننا نذكر جزء من كفاحه الفكري والثقافي اي اننا نحاول استذكار خدماته ونتاجاته في مجال التراث الكردي وابداعاته المتميزة في هذا الميدان. ولأن شعوب الارض جميعا تفخر بتراثها، وبما تتميز به عن غيرها من الشعوب الموجودة على سطح كوكبنا. وبما ان التراث الكردي الذي نعنيه يشمل التراث الشعبي او الفولكلور الكردي والاشعار الشعبية وكذلك التراث الكلاسيكي لأدبنا الذي

لتعبق شذى وعطرا فواحا كعبير البنفسج الجبلي والنرجس الفواح، ولنجمع من نتاجاته باقة كبيرة ونجعلها اكليلا واحدا سواء نتاجاته في مجال الادب والتاريخ او الفولكلور وكل ابداعاته.. جمعنا هنا نتاجاته الأدبية والفولكلورية وذلك لترابط وتلازم التاريخ والادب والتراث معا وأهمها:

١ـ ميژوى ئەدەبى كوردى ـ تاريخ الأدب الكردي وقد صدرت طبعته الأولى عام ١٩٥٢ والثانية عام ١٩٧١.

٢ـ گەشتێك لەكوردستانا ـ رحلة في كردستان سنة ١٩٥٦.

٣ـ رشتەى مروارى ـ عقد اللؤلؤ وقد صدر في ثمانية اجزاء خلال الاعوام ١٩٥٧، ١٩٥٨، ١٩٦٨، ١٩٧١، ١٩٧٢، ١٩٧٨، ١٩٨٠، ١٩٨٣.

٤ـ شورشەكانى كورد ـ الثورات الكردية لغاية ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، صدر عام ١٩٥٩.

٥ـ كوردوارى ـ التقاليد الكردية، تراث ١٩٧٤.

٦ـ آثار اخرى.

فكتابة تاريخ الادب الكردي يعتبر سفرا قيما ونتاجا رائدا في مجال تاريخ الادب الكردي او التراث الكلاسيكي المدون وهذا الكتاب كما قيمه مؤلف (الواقعية في الأدب الكردي) الدكتور عز الدين مصطفى رسول يعتبر من الكتب الكردية الكبيرة بصفحاته الستمائة والثلاث والستين وقد بلغ عدد صفحات الطبعة الثانية سبعمائة وست صفحات. ورغم انه يحمل اسم «تاريخ الأدب الكردي» فان صاحبه يسميه أوسع دائرة معارف كردية صدرت الى الان. ففي هذا الكتاب موجز لآراء مختلف المؤرخين الى يومه عن الكرد وأصلهم واسمهم ونفوسهم وتقاليدهم.. كما يقول الدكتور:

اننا في الوقت الذي نعطي المؤلف مثل هذا الحق شافعين له ذلك بظروف القارىء الكردي الخاصة، نرى أن خوض هذا البحث وبحوث اخرى تضمنها الكتاب يخرج الكتاب من كونه تاريخ ادب بل يمكن ان يسمى بخليط من التاريخ والجغرافية وعلم الاجتماع وجميع فروع علم

الكتاب قد اكتسب مأثرة اول اثر كردي من حيث جمعه المواد الكثيرة عن حياة الشعراء الكرد واعطائه تفاصيل دقيقة عنهم وعن عصرهم وظروفهم الشخصية وقد بذل مؤلفه جهدا كبيرا في التوصل الى هذه المعلومات. وان القاء نظرة واحدة على المصادر التي اعتمد عليها السجادي يوضح لنا أنه قد قرأ مصادر مختلفة ووضع جميعها موضع ثقته فاقتبس بذلك آراء مؤلفين ينتمون الى طبقات مختلفة والى مدارس فكرية مختلفة واخذ عنهم مايخص تاريخ ومنشأ الادب.

وحسب الكتاب فخرا ان جمع كل ما امكنه وبالتفصيل دقائق سيرة وحياة اربع وعشرين شاعرا من الراحلين وذكر اسماء وتواريخ ولادة ووفاة مائتين واثنى عشر شاعرا آخر اضاف اليها في الطبعة الثانية اربعة وثمانين شاعرا آخر، كما ثبت نصوصا فولوكلورية تدون لأول مرة، ونصوصا من آثار الشعراء لم تدون من قبل، وان ذلك قد جعل الكتاب دعامة كبرى للبحث ولتحليل الأدب الكردي واضاف الى الطبعة الثانية منها ملحقا عن الصحافة الكردية والقصة الكردية ومواد اخرى بلغت اكثر من مائة صفحة. لذا كان لصدور هذا الكتاب القيم اصداء طيبة في الأوساط الثقافية والأدبية الكردية داخل وخارج العراق ومن لدن المستشرقين ايضا وحسنا فعل المؤلف عندما اضاف الى مقدمة الطبعة الثانية ثلاث رسائل تلقاها من أديب كردي خارج كردستان العراق ونقصد المرحوم (محمد مهري) المحامي والمدرس بعث بها من استانبول سنة ١٩٥٤ قال فيها: منذ عام كامل وكلما سنحت لي الفرصة اقرأ أثركم النفيس وألمس مدى جهودكم وكفاحكم اللامتناهي وتضحياتكم الجسيمة - في اوج علياء الشرف - قرت عينكم وامد الله في عمركم وبيض الله وجه والديك اللذين انجبا ابنا مثلك. اخي علاء بلا تكلف ولا مجاملة اقولها: ان تاريخك للأدب الكردي! ترك أثرا وسمعة في عالم الأدبيات الكردية، فأحييت الكرد ومنحتهم روحا جديدة لهؤلاء الموجودين الآن ولأولئك الذين سيأتون. عمر الله بيتك مثلما عمرت بيوت الكرد.

كما كتب اليه (آدموندس) وهو من المهتمين بالدراسات الكردية مهنئا ومشيدا بفضله وانه قد حقق حلما طالما كان يراوده. كما يقول ان عملكم هذا يعتبر خدمة كبيرة ليس للأكراد وحدهم بل لعالم العلم والمعرفة، وكل

المهتمين بآداب الشرق يعتبرون انفسهم ممتنين لذلك الاستاذ ولمنزلته الرفيعة.

كما بعث اليه المرحوم (رفيق حلمي) احد رواد كتابة تاريخ الأدب الكردي رسالة يبدي فيها فرحته وابتهاجه بصدور هذا الكتاب كما يقول ان الكلمات تعجز ان تصف لكم تلك المشاعر التي أكنها لكم ولهذا الاثر النفيس الضخم الذي استطيع ان اقول لكم عنه بصدق انكم قد وفقتم من جميع النواحي واستطيع القول ان أثركم رائع وثمين. وبالنسبة لآثاره الاخرى المكرسة للتراث الكردي يعتبر كتابه الفولكلوري الثمين (رشتەی مرواری ـ عقد اللؤلؤ) والذي يشكل في حد ذاته ثروة ثقافية قومية لشعبنا وكنزا ثمينا لتراثه وكما يذكر الدكتور عز الدين مصطفى رسول في كتابه أدب الفولكلور الكردي: ان اجزاء (عقد اللؤلؤ) شيء جديد ونادر في ميدان تدوين الفولكلور والأدب والحركة الثقافية الكردية. وقد وجدت لها مكانة خاصة في ميدان التراث القومي الكردي وفي مجال اللغة الكردية واغنائها وتطويرها ايضا ـ وهذه الأجزاء تعتبر محاولة جريئة للحفاظ على اللغة الكردية. وفي ميدان اللهجات الكردية وتثبيت الخطب والمحادثات ضمن قصص او محاورات اللهجات المختلفة للغة الكردية وفي بعض الاماكن في هذا الميدان فانه ايضا يصلح للمقارنة. وان صح استعمال لفظة النادر او الفريد فان (عقد اللؤلؤ) كتاب او اثر (نادر). كما خلدت هذه المجموعة الثمينة من مجلدات (رشتەی مرواری ـ عقد اللؤلؤ) سير بعض الشخصيات الشعبية الكردية وارخت لبعض الاحداث التي وقع بعضها قبل اكثر من قرن واحد، فهي بذلك تفيد الباحثين والمؤرخين وحتى علماء الاجتماع وغيرهم. لانها تضم نوادر وطرائف وعادات ترتقي الى مصاف مايمكن تسميته بوعاء للمأثورات الشعبية والفلسفة الشعبية او ما اصطلح على تسميتها بابداع الجماهير وليست هذه المجلدات وكتاب تاريخ الادب الكردي هي كل ماقدمها الفقيد السجادي من جهود في سبيل الحفاظ على التراث الكردي وأدبه فهناك آثار اخرى للفقيد يمكن ذكرها وتسطيرها وتسجيلها له بمداد الفخر والاعتزاز فكتابه (جولة في كردستان) الذي اصدره عام ١٩٥٦ كانت مواضيعه في نظر الكثيرين غريبة، فكان الفقيد يجيبهم بقوله: أنا لم اكتب

هذا ليومنا هذا وستقدرون اهميته في المستقبل ورغم انه لم يمض وقت طويل على صدور هذه الرحلة لكننا نرى ان الكثير من مواضيعها والمعلومات التي تتضمنها اكتسبت اهمية كبيرة وحتى من ناحية التقسيمات الادارية والشكل الجغرافي. من هنا نلمس بوضوح ان الفقيد كان يدري على اي امر هو مقدم! حينما يكتب نتاجاته، ولم يكن يفعل ذلك عفوا، كما ان اجابته ورده للمعترضين على مجموعة (عقد اللؤلؤ) يعتبر تأكيداً لهذا القول فكتب يقول: ان الذين نقدوني بشدة هم الذين رغبوا في قراءة كتبي تلك وكانوا يقرأونها في الخفاء، ويتوقون الى اصدار جزء آخر من الكتاب..

وكما ذكر الاستاذ جمال بابان في حفل تأبين الفقيد: ان الكرد كغيرهم يملكون ثروة ضخمة في مجال النكات والفكاهة والطرائف الا ان ماعرقل تسجيله هو عقدة الخجل ورغم ان الفقيد كان رجل دين ويوجه اليه الكثير من الانتقادات الا ان ذلك لم يمنعه من اصدار مجلداته في ذلك الأدب وان احدا لم يتوسع مثله في هذا الميدان رغم محاولات البعض قبله.

وقدم خدمات لاتنسى للتاريخ الكردي عن وعي وادراك منه لهذا الجانب من جوانب حياة ووجود شعبه سواء بتأليفه المؤلفات التي ذكرناها أو بتأليفه المباشر في التاريخ ككتابه (الثورات الكردية) والتي ارخ فيها لأهم الأحداث والثورات.

وكما يقول الدكتور (كمال مظهر احمد) فانه وبلاشك يشكل مصدرا مفيدا احتل مكانته اللائقة في المكتبة التاريخية الكردية، ورغم ان بعض مؤلفات الاستاذ لم يكن يخلو من بعض الهفوات أحيانا لانه في معظم استنتاجاته التاريخية كان يستلهم ثقافته الذاتية التي كونها بمطالعاته الشخصية واجتهاداته ولأن معظمها كانت اعمالا بكرا كتبها في وقت كانت المصادر العلمية نادرة خلاله. ومساهمات الفقيد في توضيح وتدوين التاريخ الكردي وتراثه لاتقتصر على ماذكرنا وحسب، بل اننا اذا ماتصفحنا اعداد مجلتي (گەلاویژ) و (نزار) اللتين كان يتولى ادارتهما اتضح لنا وبجلاء كفاح هذه الشخصية الكردية المحبوبة من اجل صيانة تاريخ وتراث شعبه وتحفيز المثقفين للاقتداء بمثقفي الامم الناهضة. ويمكن الاستشهاد والاستناد الى المقالات العديدة التي كتبها على صفحات مجلة (نزار) التي اصدرها

باللغتين العربية والكردية سنة ١٩٤٨ فقد كتب في العدد الرابع منها والصادر في ١٥ مايس ١٩٤٨ كتب اقتراحا حث فيه على ضرورة كتابة تاريخ شعبه في الكتب المدرسية تحت عنوان: (اعادة النظر في كيفية مادة التاريخ) يقول: طالما نعيش في خيرات هذا البلد ونستظل بسمائه (يقصد الشعب العراقي) فأن امانينا وآمالنا واحدة، ومن الاحسن والاوفق ان يعرف أحدنا الاخر، لا أن نقصر المعرفة على فريق واحد ويوضع الاخر في الظلمات، مما يوجد المجال لهجمات المستعمرين على هذه النقطة الحساسة ويدعو الى شيء من سوء التفاهم الذي نريد القضاء عليه قضاء مبرما. ويختتم مقالته بقوله: انا ندعو الى تدريس تاريخ الاكراد في مدارسنا ولنوثق من عرى وحدتنا واخائنا أكثر من قبل.

كما تتجلى نظرته للتاريخ في المقدمة التي كتبها لكتاب (كردستان الوسطى) لمؤلفه الاستاذ عبد الرقيب يوسف حيث كتب مايلي: التاريخ هو الحد الفاصل بين الماضي والحاضر، فيساعدنا فهم ما مضى على فهم مانكون فيه، او بالاحرى التاريخ قصة الانسانية والبشرية في حال تطورها ونشوئها منذ ان ظهرت على يد الانسان الى يومنا هذا، فعلينا ان اردنا أن نعلم ونفهم وضعنا الحاضر ان نرجع الى سير الأحقاب التي مضت ونأخذ من جُذورها دروسا لكي نصل بها الى شاطيء الحقائق التي لعبت بها البشرية لتكوينها في القرون التي رقت فيها او تقهقرت وبواسطته نستطيع ان ندرك الانظمة السياسية والاجتماعية والعلمية والدينية التي مرت علينا في الايام الغابرة.

وأما عن الدور الذي نهضت به مجلة (گەلاویژ) في ميدان التاريخ الكردي، فقد تحدث عنه (الدكتور كمال مظهر احمد) في كتابه المعنون (ميژوو- التاريخ) حيث كرس لهذا الموضوع عدة صفحات من كتابه المذكور لتقييم دور مجلة (گەلاویژ) في خدمة التاريخ الكردي فكتب يقول: ان مجلة (گەلاویژ) في هذا الميدان ايضا مثل الكثير من الميادين الاخرى، كانت الصحيفة الكردية الاولى، ولحد الان فان أية جريدة او مجلة كردية صادرة في العراق او خارجه لم تكرس صفحاتها مثل (گەلاویژ) للاهتمام بالتاريخ عموما وبالتاريخ الكردي خصوصا. وقد خصصت (گەلاویژ) عدة

ابواب وزوايا للتاريخ مثل زاوية (من التاريخ) و(الكرد عند الأجانب) كما ان اشهـر مؤرخي الأربعينـات قد نشـروا على صفحـات (گـهلاويـژ) الأبحـاث التاريخية من أمثال امين زكي وتوفيق وهبي وحسين حوزني موكرياني وعلاء الدين السجادي وعدد اخر من المؤرخين .

اضافة الى اولئك فان عددا من المثقفين الكرد من خارج العراق نشروا المقالات التاريخية على صفحات (گهلاويژ) من امثال عثمان صبري ونثازا السنـوي، واحيـانـا كانت (گـهلاويـژ) تخصص نصف مجمـوع صفحـاتهـا للابحاث التاريخية مثل العددين الخامس والسادس من السنة الثالثة. ومن المهـام الجليلة التي يمكن ان يسجـل لـ ( گـهلاويـژ) ضمن المهام الجليلة التي اضطلعت بها اقدامها على نشر نتاجات عدد من المستشرقين والرحالة الاوربيين المتعلقة بالكرد. ان هذه الاعمال وغيرها هي التي فتحت العيون ونبهت الاذهان لتاريخ شعبنا الذي كان شبه مجهول عند الاقربين والأبعدين وحتى عند الكثيرين من مثقفي شعبنا وهي التي مهدت لبروز هذه الكوكبة المبـاركـة من المؤرخين الكـرد المعـاصـرين. كما لايمكن تجاهل المقالات والابحـاث التي نشـرت باللغـة العـربيـة في مجلة (نـزار) والتي كان لولبهـا المتحرك الفقيد علاء الدين السجادي. فان القاء نظرة عاجلة على اعدادها تبين أنهـا كانت من الأسـاس تهـدف الى تعـريف القـراء العرب بأدب الكرد وتأريخهم وتراثهم واعلامهم. ففي العدد الثاني من مجلة (نزار) الصادر في ١٥ نيسان ١٩٤٨ كتب ابن خلكان تحت عنوان: العرب والأكراد. .

«وبعد فهذه الصحيفة انما هي لسان يدعو الى الوحدة بين قومين جمع الله بينهما بدين الاسلام، وفتح قلوبهما بنور الحق ومهما دعا الداعون الى التفريق بينهما بمزاعم ومهاترات فقد ضاعت اقوالهم هباء وساء مايفعلون. ان الاكراد سكنوا هذه الجبال والوهاد التي تدعى بـ (كردستان) منذ اقدم عصور التـاريـخ، وهم قوم على مايقـول الثقـاة في علم الأجنـاس انهم من العنصـر الهندو أوربي اومـا يدعون بالآريين وبالرغم مما حدث من هجرة قوم من الاقوام وفنائهم وغلبة آخرين عليهم وحلولهم محلهم فان هؤلاء الأقوام هم الـذين دعـوا في التـاريـخ القـديم باسم «كردوخى» كما نشرت المجلة تباعا بحث باسيل نيكيتين عن الاكراد ومواضيع عن صلاح الدين الأيوبي والدعوة

الى انشاء المجمع العلمي الكردي وكرسي اللغة الكردية في الجامعة العراقية وعرض لكتاب تاريخ الدول والامارات وزاوية من اعلام الأدب الكردي فكتبت عن بى كەس وزيوەر ومحمد امين زكي وغيرهم. ومن نتاجاته الهامة المخصصة والمكرسة للتراث الكردي كتابه القيم (كوردواري ـ العادات الكردية) والذي يعتبر جهدا مباركا اخر اضافة الى جهوده الخيرة الكثيرة وجمع فيه أهم العادات والتقاليد الكردية في الأفراح والأحزان فضمنه التقاليد الكرديه وأهم العادات في الافراح والأحزان والحياة في القرى والأرياف اوحياة الخيام. وكذلك طقوس الصيد والسفرات، وكما كتب في المقدمة: ان مايميز قومية عن قومية اخرى هي اللغة والعادات والتقاليد والأرض او الوطن والأدب. كما يقول أيضا:

وبما انني اعتبر نفسي واحدا من ابناء هذا الشعب وانه منذ امد بعيد فتحت عيني على العادات والتقاليد والاشياء التي دأب عليها الكرد وعشقتها، ولأن الارض ضاقت واقتربت جهاتها وربما وبسبب تقارب الاجناس والاقوام المختلفة من بعضها وخصوصا من الكرد الحائر اقول ربما ضاعت هذه العادات شيئا فشيئا.. وانني جمعت ماكان في وسعي ان اجمعها وان اضمها في هذه الصفحات المطبوعة، وعندما تطبع فانها لاتفنى. واستطعت ان اجمع الى هذا الحد.. وان أقدمها هدية لامتي التي مازالت تعاني الاضطهاد في اماكن عديدة وان اقدمها للاجانب الذين يلفظون كلمة الكرد باستنكاف وتعال الخ.. والمقدمة مؤرخة في ١٩٦٨/١١/٢٣. وهكذا استطاع ان يقدم لوحات حية للعادات الكردية وان يدون العشرات من الالعاب الشعبية الكردية. وان كتابه المعنون (خوشخواني ـ البلاغة) الذي طبع عام ١٩٧٨ على نفقة (جامعة السليمانية ـ صلاح الدين حاليا) مكرس للبحث عن البلاغة في الشعر والنثر الكرديين ولكي لايقال أن الكردية لابلاغة فيها كما ان هذا العمل في حد ذاته يعتبر خدمة للأدب وللتراث لانه يستند على التراث الكلاسيكي الكردي.

وان كتابه المعنون (دەقەكانى ئەدەبي كوردي ـ نصوص الأدب الكردي) الذي صدر عام ١٩٧٨ ايضا وضمن مطبوعات المجمع العلمي الكردي لايخرج عن هذا الاطار وكذلك كتابه السابق (نرخ شناسى ـ النقد) الذي طبع

عام ١٩٧٢ وهـو كغيـره من نتـاجـات الفقيـد يستلهم التـراث الكردي الأدبي الكلاسيكي ومكرس لهذه الغاية ايضا. وأخيرا ونحن نستقبل ذكرى مرور عام واحد على رحيل ذلك الاديب الكبير والانسان النادر الفذ الذي كرس حياته لخـدمـة شعبـه وتـراثـه وتحـول في ممـاته الى رمز من رموز المخلصين لهذا الشعب والعـاملين من اجـل تقـدمـه وخيـره والـذي تشكل هذه السطور كشفا لجـانب واحـد من جوانب حيـاتـه الـواسعة المثمرة ومن خدماته الجليلة لبني قومـه وهـو رجـل الـدين المؤمن الـذي لم يعرف التزمت والذي كان كما ذكر الاستـاذ محمـد جميـل الـروزبيـاني في الحفـل التأبيني الـذي اقيم لمناسبة أربعينيته.. انه كان يحب الموسيقى والمقامات الكردية وكان يترنم بها في الخفاء، وهو الذي عاش منزويا في معتكفه لكنه ظل قريبا من الناس رغم بعـده عن الأضـواء والصخب فعمـل بصمت واخـلاص وقـدم نتـاجات هامة لايمكن تجـاهلهـا وستظـل شاهـدة على فضله وعلمـه واخلاصه وحبه لشعبه وهي التي الحقته وبجدارة وبالالتصاق مع جملة مواقفه بموكب الخالدين في التاريخ فسلام عليه في العليين مع الشهداء والصادقين.

# المراجع


١ـ الواقعية في الأدب الكردي ـ الدكتور عز الدين مصطفى رسول ـ بيروت ١٩٦٦ (ص٢١-٢٤).
٢ـ ميژوو ـ دوكتور كەمال مەزهەر ئەحمەد (١٤٤-١٤٨) مطابع دار افاق عربية ـ بغداد ١٩٨٣.
٣ـ نفس المصدر المذكور (ص١٨٢-١٨٤).
٤ـ الـدولـة الـدوستكيـة في كردستـان الـوسطى ـ عبد الرقيب يوسف (ص٥) مطبعة اللواء بغداد ١٩٧٢.
٥ـ ئەدەبی فولكلوری كوردی ـ دكتور عیزەدین مستەفا رەسوول (١٤٠-١٥٢) بەغدا ١٩٧٠.
٦ـ وقائع الحفل التأبيني المقام في جمعية الثقافة الكردية في أربعينية الاستاذ علاء الدين السجادي جريدة العراق ع ٢٧٥٦ في ١٩٨٥/٢/٢١.

٧ـ اعداد من مجلة (نزار) الصادرة باللغتين العربية والكردية لسنة ١٩٤٨-١٩٤٩ .

٨ـ مؤلفات الفقيد المشار اليها ضمن الموضوع .

**العراق ٣ شباط ١٩٨٦**

# پاش مەرگت بە ساڵێك بابە گیان!

دلێر علاءالدین سجادی

ساڵێ لەمـــەوپێش، کۆڕو کۆمەڵانی ئەدەب و ڕۆشنبیـــری کورد، کۆستێکی تازەی جەرگبـــڕی کەوت. ئەوەش کۆچی دوایی مامۆستـای خوالێ خوشبـوو علاءالـدیــن سجــادی بوو، کە لە ئێـــوارەی ڕۆژی پێنج شەممەی ١٣/١٢/١٩٨٤دا، لە پڕ، بە دەردی دڵ، سەری نایەوە.

کۆچی سجادی زیانێکی گەورە بوو، نەك تەنها لە ئێمەی کوڕو منالّ و کەسـوکـاری، بەڵکـو لە هەمـوو گەلی کوردو بەتـایبـەتی لە ئەدەبی کورد. بە مەرگـی سجــادی دیـــوارێکـی گەورەی خۆشــەویستیو وەفـــاو دڵســـۆزیو خزمـــەتگـــوزاری هەرەسی هێنـا. بەڵام هەرچـەنـد ئەو بە لەش کۆچی کرد، بەجێی هێشتین، کردەوە بەرزەکـانیو بیرەوەرییە پاکـەکـانی هەرگیـز نارۆن و لەیادناچن. ئەوەی هەمیشە لە دڵ و دەروونی خەڵکا زیندووە کە چەند خۆی بە کەم ئەزانی لەگەڵ خەڵکی سادەو نیازپاکا، ئامۆژگاریو ڕێنموونییەکانی بۆ نەوەی نوێی کورد لەبیرناچنەوە. خزمەتە زۆرەکەی بۆ ئەدەبی کورد هەرگیز کوێر نابێتەوە.

بابـە گیـان! تۆ مرۆیــەکی ڕووخـۆش و دلگـەش بووی، بەوپەڕی فراوانی سنگەوە پێشوازیت لە میوانەکانت ئەکرد کە هەمیشە ئەهاتن بۆ ئەنجومەنی ئەدەبیت. ئەگــەرگڵوبەردی گۆڕ لاشــەت بگــرێتــە خۆی، کارە زانستیو ئەدەبییەکانت هەموو کون و کەلەبەرێکی کوردستانیان گرتوەتەوە.

تۆ لە ساڵانی چلەوە خزمەتی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کورد ئەکەی. ئەو کارە مەزنـەی لە دەرکـردنی (گـەلاوێـژ) و (نزار)ا کردت ئەستێـرەیـەگی گەشـە بە ئاسمـانی ڕۆژنـامـەنـووسی کوردییەوە. خۆ کاری مەزنی نووسینی (مێژووی ئەدەبی کوردی) کە ٣٤ ساڵ لەمەوبەر بلاوت کردەوە، تائێستا کەس نەك هەر لەو چاکتـر بەڵکـو لەو ئایـەختـریشی نەنـووسیـوە. هەرووەهـا هەرکـام لەو ٢٠ کتێبەیتر کە دوابەدوای یەك بلاوت ئەکردنەوە، هەر لە (ناوی کوردی)یەوە

بیگره تا هەر هەشت بەرگەکەی (ڕشتەی مرواری) و (گەشتێك لە کوردستانا) و (دووو چامەکەی نالی وسالم) و(کوردواری) و (خۆشخوانی) و (دەقەکانی ئەدەبی کوردی) و (هەمیشە بەهار) و (نرخ شناسی) و ئەوانی‌تر کە بەتەنها خۆیان جێگەی کتێبخانەیەکیان بۆ ئەدەبی کوردی گرتوەتەوە.

بابە گیان، تۆ وەختی مەرگت نەبوو. تازە وەختی ئەوەت هاتبوو قۆڵی لێ هەڵماڵیو سالانی خانەنشینی بە هێنانە بەرهەمی سەرچاوەی چاك و بەپێزتر بۆ ئەدەبی کوردی بەریتەسەر. بەڵام کوستی گرانی (دانا)ی جوانە مەرگ کە گیانی پاکی بەخشی بۆ بەرگری لە نیشتمان، کەلێنێکی گەورەی کردە دڵ و دەروونت. لەگەڵ ئەوەشا وەك پیاوێکی ئازاو قارەمان و بەجەرگ بریارت دابوو ورە بەرنەدەیو هەر خەریکی خزمەت بی. بەڵام هەموو شتێ بە ئارەزووی دڵی ئادەمیـزاد ناڕواو وادیـارە شتیوا هەیـە لە خواست و ویستی ئادەمیـزاد گەورەتر بێ.

بابە گیان! ئاوا ناوەخت کۆچت کردو خەم و خەفەت و کەسەرت بۆ ئێمەو دڵسۆزانی ئەدەبی کوردی بەجێ‌هێشت.

دەسا خوات لەگەڵ باوکی شیرینم و ڕۆڵەی دڵسۆزی گەلی کوردو ئەدەبی کورد. خوات لەگەڵ و هەمیشە لە دڵ و دەروونی هەموو کەسانی نیازپاکی ئەم گەلەدا ئەژیت و مردن زۆر لەوە بیدەسەڵات ترە کە یادی پاکی دڵسۆزی وەك تۆ کوێر کاتەوە.

١٩٨٥/١٢/١٣

العراق ١٩ شباط ١٩٨٦

# رحيـــل

شـــعر: هوشيار حسين البرزنجي
ترجمة: جمـال عـمر غـهمبــار

«مهداة الى روح الفقيد علاء الدين السجادي الطاهرة
في ذكرى رحيله الابدي»

لهيب النار،
مثلما يتذكره القلب، فجاة..
هدير امواج البحر، حين يصمت.
والرياح الغضبى، حين تهدأ
من كثرة همومها..
والقمر، يحتضنه الهدوء،
والسماء، تمطر الغضب..
واليراع، يصيرُ عاجزا..
عن كتابة الشعر..
والقلب، يأكله القلق..
ياترى، هل ان وردة، قد ذبلت؟
ام، سحابة خريفية، قد جعلت
من احد النجوم الملتفة حول القمر،
يلفظ انفاسه الاخيرة..؟
ام، ثمة اديب عالم، ومرشد،
قد نام، قرير العين، والى الابد؟



أيها «الفرات» على جناح الغيوم..

قد انفطرت موتا، وتناثرت
اجزاؤها في حضن التراب؟
■ ها هي الغيوم، صامتة
ليس لديها جواب،
تلوح من بعيد، وقلبها، كما نحن
ملؤه الجراح
■ ايها الخريف الدامي،
فيك، تورق الازهار..
افهذا، وقت الرحيل؟ أم ماذا؟
رحيله هذا، كبير..
فكبره، يستنطق الكلمة؛
مؤرخ فذ، قد رحل..
فمن يكمل «عقد اللؤلؤ»؟
فانوس مضاء في «كردستان»
قد انطفأ..
أيها العالم، يا رفيع المقام..
قلمك، نبع ذهب..
فها نحن، نقطع العهد على انفسنا،
ان نخلد اسمك،
وتبقى اعمالك خالدة
ما بقيت عجلة التاريخ
تدور.. وتدور..

جريدة العراق/ ١٩٨٦/٢/٢٢

# پێڕەس

# ذكرى السجادي

مجموعة الكلمات والقصائد التي ألقيت في الحفل التأبيني المقام تكريماً لذكرى فقيد الثقافة الكردية المرحوم الأستاذ علاء الدين السجادي أو نشرت في الصحف والمجلات العراقية بمناسبة وفاته

جمع :

دلير علاء الدين السجادي

طبع بمساعدة الأمانة العامة للثقافة والشباب في منطقة الحكم الذاتي

مطبعة [illegible] ـ بغداد

[illegible]